# دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاری

((لێوەکۆڵینێکی شرۆڤەکارانەی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی
تایبەت بە یۆگسلافیای جارانە بەبەراورد
لەگەڵ دادگەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆو رواندا))

نووسینی
د. مرشد احمد السيد
احمد غازى الهرمزى

و: ئاسۆ کەریم

**ناوی کتێب: دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاری**

– ((لێوەکۆڵینێکی شرۆڤەکارانەی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگسلافیای جارانە بەبەراورد لەگەڵ دادگەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆو رواندا))

– نووسین: دکتۆر مورشید ئەحمەد ئەلسەید – ئەحمەد فازل

– وەرگێڕانی: ئاسۆ کەریم

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

– بەرگ: هۆگر سدیق

– پیتچنین: ژیار ئاسۆ

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– ژمارەی سپاردن: (٥٠٦)

– چاپی یەکەم: ٢٠٠٥

– نرخ: ٢٠٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە – هەولێر

زنجیرەی کتێب – ٢ – (١٠٥)

ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

هەولێر: پشت رۆژنامەی خەبات

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن: 2260311

# ناوەڕۆک

## فەسڵی یەکەم

## فەسڵی دووەم

## بەرایی

- ئەم کتێبەی بەردەستت، لە زمانی عارەبییەوە کراوە بە کوردی و دوو مامۆستای زانکۆی بواری قانوون نووسیویانەو سالّی ٢٠٠٢ لەلایەن (**دار الثقافة و دار العلمية الدولية**)ەوە لە ژێر ناوی (**القضاء الدولي الجنائي – دراسة تحليلية للمحكمة الدولية الجنائية الخاصة بيوغسلافيا مقارنة مع محاكم نورنبرغ و ورواندا**) چاپکراوە.

- من ناوی کتێبەکەم دەسکاری کردووەو کردوومە بە (**دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی – لێوەکۆڵینێکی شرۆڤەکاریی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگسلافیای جارانە بەبەراورد لەگەڵ دادگەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆ و رواندا**).

- سەبارەت بە زاراوە قانوونییەکان, بەزۆری پشتم بە فەرهەنگە قانوونییەکەی دکتۆر نوری تاڵەبانی بەستووە.

- هەندەی من پێم شك بێ لە بواری قانوونی نێودەوڵەتیدا، بەتایبەتی قانوونی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی، کتێبخانەی کوردی هەژارە، نەمازە دوای رووخانی رژێمی بەعس و گرتنی سەرە زلەکانی ئەو رژێمە و دامەزراندنی دادگەیەکی تاوانگەری بۆ دادگاییکردنی ئەوانە کە بە پێشێلکاریی زلی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی تۆمەتبار کراون. بۆ تیشك خستنە سەر ئەم بوارە بەپێویستم زانی ئەم کتێبە بکەمە کوردی.

وەرگێڕ

**پاییزی 2004**

## فەسڵی یەکەم

## بنەمای قانوونیی دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتی

ئەنجوومەنی ئاسایش لە بڕیاری ٨٠٨ی خۆیدا، بڕیاری دا کە دادگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ دادگاییکردنی ئەو کەسانە دادەمەزرێ کە لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی International Humanitarian Law بەرپرسن کە لە ساڵی ١٩٩١-ەوە لە هەرێمەکانی یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون[١].

لێ ئەم بڕیارە روونی نەکردبۆوە کە دادگەیەکی لەم بابەتە چۆن دادەمەزرێ و چ بنەمایەکی قانوونیی هەیە[٢]. وەلێ ئەنجوومەنی ئاسایش بە پشتبەستن بە بڕگەی ٢ی

---

[١] بڕگەی ١ ی بڕیاری ژمارە ٨٠٨ی رۆژی ١٩٩٣/٢/٢٢ی ئەنجوومەنی ئاسایش، نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٨، ١٩٩٣.

[٢] بەر لەم دادگە نێودەوڵەتییە، پەیمانی پاشکۆی رێککەوتنی رۆژی ١٩٤٥/٨/٨ی لەندەن-ی تایبەت بە راوەدوونان و سزادانی تاوانبارە زلەکانی شەڕ لە دەوڵەتانی تەوەرەی ئەورووپی (ئەلمانیا، ئیتالیا) و پەیمانی پاشکۆی جاڕنامەی تایبەتی (جەنەرال ماك ئارتەر)ی فەرمانەدەی باڵای هیزەکانی هاوپەیمانان لە رۆژهەڵاتی دوور و لە ١٩٤٦/١/١٩ لە تۆکیۆ دەرچووبوو، بنەمای قانوونیی دامەزرانی هەردوو دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازیی نۆرمبێرگ و تۆکیۆیان پێکدەهێنا، لەمبارەوە بگەڕێوە بۆ:

رێککەوتنی تایبەت بە دادگاییکردن و سزادانی تاوانبارە زلەکانی شەڕ لە تەوەرەی ئەورووپی کە پەیمانی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی گرتبووە خۆ.

UN, Treaty Series, Vol. 82, p.280

جاڕنامەی تایبەتیی فەرماندەی باڵای هێزەکانی هاوپەیمانان لە رۆژهەڵاتی دوور و پەیمانی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی بۆ دادگاییکردنی تاوانبارە زلەکانی شەڕ لە رۆژهەڵاتی دووردا.

Naval War College, International Law Document, 1946-1947, N. W. C. of U.S.A, U.S Government printing office, Vol. 45, 1948, p.319.

هەروا قانوونی ژمارە ١٠ی ئەنجوومەنی چاوەدێریی سەر بە هاوپەیمانان-یش، لە ناوچە داگیرکراوەکاندا (ئەلمانیا)، دادگەی نێودەوڵەتی بۆ سزادانی تاوانبارانی دیکەی شەڕ، ئەو تاوانبارانەی کە وەزیفەی کارگێڕیی و سەربازییان هەبوو، دامەزراند، بۆ بەدواداچوونی ئەم قانوونە بگەڕێوە بۆ:

Allied Control Council, Military Government Legislation, Berlin, Germany, 1945

بابەتی دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگریی (چ هەمیشەیی بێ چ تایبەتی)، ئاریشەی کامە شێواز لەبارە بۆ ئەم پێکهێنانەی هێنایە گۆڕێ. هەندێك پێیانوایە، رێوشوێنی لەبار بۆ پێکهێنانی دادگەیەکی لەم بابەتە، یان ئەوەتا دەبێ لە رێگەی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتییەوە بێ کە لە نێوان دەوڵەتاندا بەسترابێ و هەر خۆشیان پێڕەوە ئەساسییەکەیان

بڕیاری ٨٠٨، سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانی راسپارد کە رەشنووسی گەلاڵەنامەیەك بۆ دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران ئامادە بکا. سکرتێری گشتیش لە راپۆرتی خۆیدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش[٣] دەڵێ: دەبێ دادگەی نێودەوڵەتی لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایش خۆیەوە لەسەر بنچینەی بەکارهێنانی دەسەلاتەکانی فەسڵی حەفتەم و بە پشتبەستن بە ماددە ٢٩ی پەیمانی نەتەوەیەکگرتووەکان UN Charter وەکو رێوشوێنێك بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتیی[٤]، دابمەزرێ.

ئیدی بەم پێودانگە، ئەنجوومەنی ئاسایش لە دانیشتنی ٣٢١٧ی رۆژی ٢٥/٥/ ١٩٩٣ دا، بڕیاری ٨٢٧ی[٥] دا. بەپێی ئەم بڕیارە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی

راستاندبێ، یان ئەوەتا لە رێگەی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتییەوە بووبێ کە دەستەیەکی نێودەوڵەتیی شایستە پەسندی کردبێ (بۆ نموونە: وەکو کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە رێگەی بانگهێشت بۆ کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی). هەندێکی دی، ئاماژە بۆ پرسی هەمووارکردنی پەیمان UN Charter، یان هاتنەناوانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەو پێیەی فراوانترین دەستەیە لە نەتەوە یەکگرتووەکان و دەبوایە دەورێکی لە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریدا هەبایە. دەکەن.

[٣] راپۆرتی رۆژی ١٩٩٣/٥/٣ ی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێشکەشکراو بە ئەنجوومەنی ئاسایش، بە پشتبەستن بە بڕگەی ٢ی بریاری ٨٠٨.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیۆمێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٨، ١٩٩٣، دۆکیومێنتی S/25704

[٤] ماددە ٢٩ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەڵێ:
(( ئەنجوومەنی ئاسایش دەکارێ، لکی ناسەرەکی بۆ راپەڕاندنی ئەرك و فەرمانەکانی خۆی، کە بە پێویستیان دەزانێ، دابمەزرێنێ)). سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، روونی کردەوە کە ئەم پێشنیازە، مفاو سوودێکی خێرای لێدەکەوێتەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە کاریگەریشی بۆ سەر تەواوی دەوڵەتان دەبێ، چونکە دەوڵەتان ناچارن پابەندی بن و هەر کردەیەکی پێویستیش بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری گۆرین، وەکو رێوشوێنێکی داسەپاو بە پێی فەسڵی حەفتەم، پەیڕەو بکەن.

[٥] لە بریارەکەدا هاتووە:
- ئەنجوومەنی ئاسایش، راپورتی سکرتێری گشتی دەڕاستێنێ.
- بەپێی ئەم بریارە، بریار درا دادگەیەکی نێودەوڵەتی دابمەزرێ. تاکە مەبەست لەم دادگەیە، دادگاییکردنی ئەو کەسانەیە کە لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونیی نێودەوڵەتیی مرۆیی بەرپرسن کە لە ١٩٩١/١/١-ەوە تا وادەیەك کە ئەنجوومەنی ئاسایش دوای بەرقراربوونی ئاشتی، خۆی دیاری دەکاو، لە هەرێمەکانی یۆگۆسلافیای

تـاوانگریی تایبــەت بــە یۆگۆسـلافیای جـاران International Criminal Tribunal For Former Yugoslavia (ICTY) پەسندکرا.

---

جاراندا ئەنجامدراون. بۆ وەدیهێنانی ئەم مەبەستە، پێڕەوی ئەساسیی دادگـەی نێودەوڵـەتی کـە لـە گـەڵ راپـۆرتی ئاماژەبۆکراوی سەرێدا هاوپێچکراوە، پەسند کرا.

- داوا لە سکرتێری گشتی دەکرێ کە هەر پێشنیارێکی لە دەوڵەتانەوە لەمەڕ تابلۆی بنەما دادڕەوییەکان و سەلماندنەوە بە پێی مادده ١٥ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی، پێبگات، بخاتە بەر دەست ئەو دادوەرانەی کە بۆ دادگەی نێودەوڵەتی هەڵدەبژێردرێن.
- بریار درا سەرجەم دەوڵەتان بە پێی ئەم بریارەو پێـڕەوی ئەساسـیی دادگـەی نێودەوڵـەتی، هاریکارییـەکی تـەواوی دادگەی نێودەوڵەتی و دامودەزگاکانی بکەن. بەم بۆنەیەوە دەبێ دەوڵەتان لە چوارچێوەی قانوونی نێوخۆی خۆیانـدا، هەر رێوشوێنێکی پێویست بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم بریـارەو پێـرەوی ئەساسـیی ICTY بگرنەبـەر، بـە پابەندیی دەوڵەتانیشەوە سەبارەت بە بە دەمەوەچوونی داواکاریی کۆمەکخواستن، یان هەر فەرمانێکی لەلایەن یەکێ لە دایرەکانی دادگەکەوە بە پێی ماددەی ٢٩ی پێڕەوی ئەساسی دەرچووبێ.

### ١-١: دەسەلاتی ئەنجوومەنی ئاسایش

### سەبارەت بە دامەزراندنی دادگەگەلی نێودەوڵەتیی تاوانگریی تایبەت

بە پێی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەنجوومەنی ئاسایش، چەندین دەستدانی Competence جۆرەوجۆری هەن. ئەم پەیمانە، بەرپرسیارێتیی سەرەکی، سەبارەت بە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، خستووەتە ئەستۆی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە، سەرباری دەستدانی دیکە کە مۆرکی جێبەجێکارییان هەس[٦].

دادیاری داکۆکی Defence Counselسەبارەت بە دامەزراندن و نارەوایی دادگەی نێودەوڵەتی، چەند رەخنەو باسێکی هێنابووە گۆڕێ، چونکە پێکهێنانی ئاوا دادگەیەك دەبێ بە گوێرەی قانوون بێ. بە مانایەکی تر، یان ئەوەتا ئەم دادگەیە دەبوایە بە هۆی رێککەوتننامەیەکی چەند قۆڵیی و لە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا پێکبێ، یان لە رێگەی هەمواركردنی پەیمانی UN ەوە بهاتبایە ئارا، نەك بە بریارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش، ئەمیش بە لەبەرچاوگرتنی چەند تێبینیەکی وەك[٧]:

---

[٦] دەکرێ دەستدانەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، بەسەر سێ جۆردا دابەش بکەین، یەکەم: تایبەتە بە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، ئەمە دەستدانی سەرەکیی ئەنجوومەنە. دووەمیان: سەروبەرکردنی کێشەو ئاریشەکانە بە رێگەی ئاشتیخوازانە. دیاهی: دەستدانێکی دییە کە بایەخی خۆیان هەیە. گرنگترینیان ئەمانەن:

I- بەشداریکردنی ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتی لە هەڵبژاردنی سکرتێری گشتیی UN دا ( مادده/٩٧).

II- بەشداریکردنی ئەنجوومەنی ئاسایش لە هەڵبژاردنی ئەندامانی دادگەی دادی نێودەوڵەتی International Court of Justice (I.C.J) بە پێی ( مادده ٤)ی پێڕەوی ئەساسیی دادگای ناوبراو.

III- دەستدانی پەیوەست بە بریارگەلی ئەندامێتیی لە رێکخراوی نێودەوڵەتیدا (فەسڵی دووەمی پەیمانی UN).

IV- رێکخستنی سیستەمی چەکداربوون (ماددەی ٢٦).

V- لە حاڵەتێکدا کە یەکێ لە دوو لایەنی پێکناکۆکی دۆزێکدا، بە بریاری دادگەی دادی نێودەوڵەتی کە لەم بارەوە داویە، رازی نەبوو، ئامادە نەبوو جێبەجێی بکات، ئەوا لایەنی دیکەی کێشەکە بۆی هەیە پەنا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش ببا، ئەنجوومەنیش کە دیتی پێویستییەك هەیە، ئەوا رادەسپێرێ ، یان بریار دەدا کە چ رێوشوێنێك بۆ جێبەجێکردنی بریارەکە پەیرەو بکەن (مادده/٩٤).

[٧] I.C.T.Y. Decision on the Defence Motion for Interlocutory Appeal on Jurisdiction, Case, No: IT-94-A72, 20 Octo. 1995, p.32.

- بەپێی ماددە ٢٩ی پەیمانی UN، چ پێشینەیەك سەبارەت بە دامەزراندنی دادگەگەلێکی نێودەوڵەتی نەبووە، هەروا بێتەوە کۆمەڵەی گشتیش لەوەتەی نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزراوە، لە پێکهێنانی هیچ دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگریی تایبەتدا دەستی نەبووە.
- پەیمانی UN، مافی دامەزراندنی دەستەیەکی دادوەری بە پێی دەسەڵاتەکانی فەسڵی حەفتەم، بە ئەنجوومەنی ئاسایش نەداوە.
- ئەنجوومەنی ئاسایش لە کێشەگەلی چەکدارانەی جودا-جودادا، کە لەوانەیە لە هی یۆگۆسلافیای جاران توندوتیژتریش بووبن، دادگەی نێودەوڵەتی لەم بابەتەی پێکنەهێناوە.
- دادگەیەکی نێودەوڵەتی لەم بابەتە، ناکارێ دەورێکی لە پتەوکردنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتیدا هەبێ، نەمازە لە کۆمارەکانی یۆگۆسلافیای جاراندا.
- دەستەیەکی لە گوێن ئەنجوومەنی ئاسایش، کە لە بنەڕەتدا دەستدانی کارڕاپەڕاندنی هەیە، ناکارێ لە هەمان کاتدا دادگەیەکی نێودەوڵەتیی سەربەخۆو بێلایەن بۆ دادگاییکردنی چەند جۆرە تاوانێکی دیاریکراو پێکبهێنێت.
- دەکارین ناوەڕۆکی ئەم وتووێژانە لەم پرسیارانەدا چڕو پوخت بکەینەوە:
- داخوا مەترسییەکی راستەقینەی ئەوتۆ لە ئارادا هەبووە کە پاساوی مایەی خۆتێکردن بە گوێرەی فەسڵی حەفتەم وەکو بنەمایەك بۆ دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی بداتەوە؟
- ئەگەر داوایەکی وەسا سەبارەت بە لە ئارادابوونی مەترسییەکی لەم بابەتە، یان هەڕەشەیەك بۆ سەر ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هەبوبێت، داخوا ئەنجوومەنی ئاسایش رێگەی پێدراوە هەر رێوشوێنێك بۆ گەڕاندنەوەی ئاشتی و تەنایی، یان بۆ پاراستنی ئەو دووانە پەیڕەو بکا، یان ئەوەتا ئەنجوومەنی ئاسایش پابەندە بە هەڵبژاردنی ئەو رێوشوێنانەی کە لە هەر دوو ماددەی ٤١ و ٤٢ و هەندێ جاریش لە ماددە ٤٠ی پەیمانی UN دا بە دەق باسیان لێکراوە؟

١- لەم رەوشەدا چۆن پاساوی دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY، بە لەبەرچاوگرتنی سروشتی دادوەریی ئەو دادگەیە، ئەگەر لە یەکێ لەم ماددانەدا ئاماژەی پێ نەکرابێت، دەدرێتەوە؟

**١-١-١:**

## دەسەلاٚتی ئەنجوومەنی ئاسایش بە بەکار هێنانی فەسڵی حەفتەم

وەك دەزاندرێ دەستدانی بنەڕەتی ئەنجوومەنی ئاسایش، پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتییە[٨]. ئەنجوومەنی ئاسایش بە گوێرەی مادده ٣٩-ی پەیمانی UN پێڕەوی ئەم دەستدانە دەکات، مادده ٣٩ یش دەڵێ:

(ئەنجوومەنی ئاسایش خۆی بریار دەدا کە داخوا هەڕەشە لە ئاشتی کراوە، یان لادان لە ئاشتی بووە، یان کارێکی دەستدرێژکاری Aggression رووی داوە، لەمبارەوە ئەنجوومەن راسپاردەگەلێ دەخاتەڕوو، یان بڕیار دەدا کە چ رێوشوێنێك بە پێی بنەماکانی هەردوو

[٨] مادده ٢٤ی پەیمانی UN ئاماژەی بۆ ئەم دەستدانە کردووە:
١- لەسەرینی ئەوەی کە ئەو کارەی UN دەیکا، دەبێ بلەزو کارا بێ، ئەندامانی ئەم دەستەیە، بۆ مەسەلەی پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، بەرپرسیارێتیی سەرەکی دەخەنە ئەستۆی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە و رازی دەبن کە ئەم ئەنجوومەنە لەبری ئەوان ئەو ئەرکانەی ئەم بەرپرسیارێتییە بەسەر ئەنجوومەنیاندا سەپاندووە، جێبەجێبکا.
٢- ئەنجوومەنی ئاسایش لە راپەراندنی ئەم ئەرکانەدا، بە گوێرەی مەرام و پرەنسیپەکانی UN کار دەکاو ئەو دەسەلاٚتانەی بە ئەنجوومەنی ئاسایش دراون، بۆ ئەوەن کە ئەنجوومەن ئەو ئەرکانەی لە فەسڵەکانی ٦، ٧، ٨، ١٢ دا دیاریکراون، رابپەڕێنێ.
دادگەی دادی نێودەوڵەتی I.C.J لە رای راوێژکاری خۆیدا لە کێشەی نامیبیا لە ١٩٧١/٦/٢١دا دیاریکردووە کە:
(ئاماژەکردنی بڕگەی ٢ی مادده ٢٤ی پەیمان بە دەستدانە تایبەتییەکان، ئەو دەستدانە گشتییانە وەلانانێت کە رێگە بە ئەنجوومەن دەدەن ئەرك و فەرمانەکانی خۆی رابپەڕێنێ.)
پرس لێرەدا ئەوەیە: داخوا دەسەلاٚتەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش تەنیا لەوانەدا کۆدەکرێنەوە کە لە بڕگە ٢ی مادده ٢٤دا هاتوون؟
ئەوە روونە کە ئەنجوومەنی ئاسایش، دەزگای سەرەکییە بۆ پاراستنی ئاشتی، دەستدانی پاراستنی ئاشتیش لە دەستدانی دەوڵەتانەوە بووە بە دەستدانی ئەنجوومەن، وەلێ ئەم دەسەلاٚتە بەرتەسك و سنووردارە، نەوەکو دەسەلاٚتی بێ سنوورو بێ کۆت.
I.C.J Namibia Case, Advisory Opinion, 21 June 1971, para 89.

ماددەی ٤١ و ٤٢ بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، یـان بـۆ هێنانـەوەی ئـەو دووانە بۆ سەر باری جاران، بگیرێتەبەر).

کەواتە بەم پێیە ئەنجوومەنی ئاسایش دەورێکی مەزن و دەسەلاٙتێکی فرەی سەبارەت بـە پاراسـتنی ئاشـتی و تـەنایی نێودەوڵـەتی هەیـە. وەلیٚ ئەمـە وا ناکەوێتـەوە کـە ئـەم دەسەلاٙتانە، سنوورێکیان بۆ نەبیٚ، چونکە ئەنجوومەنی ئاسایش دەسـتەیەکە لـە دەسـتە سەرەکییەکانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی. ئەم ڕێکخراوەش بە گوێرەی ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی کە چوارچێوەی دەستووریی ڕێکخراوەکەیە، دامەزراوە. کاری ئەنجوومـەنیش دەبیٚ لە دووتوێی ئەم چوارچێوەیەدا بمێنێتەوەو لە هـەموو بارێکـدا بـەم چوارچـێوەیەوە بەستراوەتەوە. هەم دەقەکان و هەم ڕۆحی پەیمانی UNیش ڕێگە بە ئەنجوومەنی ئاسایش نادەن لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیەدا ڕەفتار بکا و ببزوێ. ئەم پرسیارەی کە لێرەدا دێتـە گۆڕیٚ، داخۆ ئاقاری دەسەلاٙتی ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی دەقی ماددە ٣٩ی پەیمان تا کویٚ و تا چەند بڕ دەکا؟

ئەنجوومەنی ئاسایش بە جیٚبەجیٚکردنی هەردوو بەشی ماددە ٣٩، فەرمانێکی سـەرەکی خۆی ئەنجام دەدا. دیارە ئەوە مافی ئەنجوومەنی ئاسایشە کە چۆن ڕەوش دەنرخێنـیٚ بـەو شێوەیەی کـە پاسـاوی بـەکارهێنانی فەسـڵی حەفتـەمی پـیٚ بداتـەوە و دەکـاریٚ هـەر ڕێوشوێنێکی خۆی بە لەبارو گونجاوی دەزانیٚ، هەڵببژێریٚ. جـا یـان ئـەوەتا ئەنجوومـەن ڕادەسپێریٚ کە کێشەو ئاریشەکە بە شێوەیەکی ئاشـتیخوازانەو بـەپێی فەسـڵی شەشـەم بەبیٚ پەنابردنە بەر فەسڵی حەفتەم[9] سەرو بەر بکریٚ، یان ئەوەتا دەسەلاٙتە تایبەتـەکانی

[9] ماددەکان ٣٣-٣٨ (فەسڵی شەشـەم) ی پـەیمان، ماددەگـەلێکن تایبـەت بـە سـەروبەرکردنی بـە ئاشـتییانەی کێشـەو ململانێیەکان و ئەو دەستدانانە دەگرنەخۆ کە ئەنجوومەنی ئاسایش لە بارێکدا، ململانەیەکی نێودەوڵەتی، پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بخانە بـەر مەترسـییەوە، پراکتیـزە دەکـا و ئیـدی ئـەو کاتـە ئەنجوومـەن داوای چارەسـەرکردنی بـە ئاشتییانەی ململانەکە دەکا لە ڕێگەی دانوستان و لێکۆڵینەوەو ناوبژی و ڕێککەوتن و Arbitration و سـەروبەرکردنی دادوەرییەوە، یان لە ڕێگەی پەنابردن بۆ ئاژانس و سازمانی هەرێمایەتی، یان لە ڕێگەی ئەو دەستئاوێژە ئاشـتیخوازانەیەی دەوڵەتە پێکناکۆکەکان خۆیان هەڵیدەبژێرن.

خۆی بە گوێرەی فەسڵی حەفتەم بەکار دەهێنێ. ئەو بارانەی کە پاساوی بەکارهێنانی فەسڵی حەفتەم دەدەنەوە ئەمانەن: هەڕەشەکردن لە ئاشتی Threat to Peace ، لادان یان پێشێلکردنی ئاشتی Breach of Peace ، یان ڕوودانی دەستدرێژکاری Act of Aggression . بەبێ چوونەناو وردودرشتی شتەکان، مەبەست لە پاراستنی ئاشتی ئەوەیە کە: "ڕێگە بە شەڕ هەڵایساندن نەدرێ، یان ئاشتی بۆ دۆخی جارانی خۆی بگێڕدرێتەوە ئەگەر شەڕ هەڵایسا بوو."[10] بەڵام تەنایی " واتە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە ترس و خۆف و هێنانەئارای هەلومەرجێکی لەباری ئەوتۆ کە هەست بە بوونی ڕەوشێك بکرێ کە ئاشتییەکی جێگیر لە ئارادایەو حاڵەتێکی هێمنی و تەنایی هەیە کە تارمایی شەڕ لێل و تێکی نەداوە"[11].

بەڵام دەستنیشانکردنی بوون، یان نەبوونی هەڕەشە، کارێك نییە بێ کۆت و مەرج، وەلێ لە خراپترین باردا گرێدراوی مەبەست و ئارمانج و پرەنسیپەکانی پەیمانی UN —ە. لە بەر دوو هۆی سەرەکی پێویست ناکات لە پرسی بوونی هەڕەشە بۆ سەر ئاشتی لە یۆگۆسلافیای جاران بکۆڵینەوە:

یەکەم: ململانەی چەکدارانە Armed Conflict لە یۆگۆسلافیای جارانداو مەوداو ئاقاری مەترسییەکانی، ماوەیەکی زۆر، بەر لەوەی ئەنجوومەنی ئاسایش بریاری دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتی بدا، ڕوو لە هەڵکشان و زێدەبوون بوون. ئەگەر ئەم ململانەیەمان بە ململانەیەکی نێودەوڵەتی International Conflictدانا، ئەوا هیچ گومانێك نامێنێ

---

د. ابراهيم احمد شلبي، التنظيم الدولي، دراسة في النظرية العامة والمنظمات الدولية، الدار الجامعية للطباعة والنشر ، بيروت، ١٩٨٤، ص٣١٦، ٣٢٠.

هەروا بگەڕێوە بۆ:

Olivier Corten et Pierre Klein, Action Humanitaire et Chapitre VII: La redfinition du mandat et des moyens d action des forces des Nation Unies, A.F.D.I., p. 109 et suiv.

[10] خليل الحديثي، الوسيط في التنظيم الدولي، جامعة بغداد، محاضرات مطبوعة بالرونيو، ١٩٨٦، ص١٢١.

[11] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

کە ئەو ململانەیە لادان بووە لە ئاشتی ، یان هەڕەشە بووە بۆ سەر ئاشتی. خۆ ئەگەر تەنیا بە ململانەیەکی چەکدارانەی نێوخۆیی Internal Armed Conflict بەئەژمار هات، ئەوا هەڵسەنگاندنی مەترسیی ئەم ململانەیە و پەنا بردنە بەر بەکارهێنانی فەسڵی حەفتەم، دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش و شارەزایی مێژوویی ئەو لە بواری شەڕو شۆڕی مەدەنی Civil Wars وململانەی ناوەکیی چەکدارانەدا سەبارەت بە وەدیارخستن و روونکردنەوەی مەودای کارتێکردنی ئەو شەڕانە لەسەر ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی ( وەکو قەیرانی ساڵی ١٩٦٠-ی کۆنگۆ)[١٢].

ئا ئاوا دەشێ بێژین لە دووتوێی شارەزایی ئەنجوومەنی ئاسایش و نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە گشتی، لێتێگەیشتنێکی هەمەگیر هەیە کە هەڕەشەکردن لە ئاشتی بە پێی مادده **٣٩** دەشێ لە هەندێ باردا، لە ململانەیەکی چەکدارانەی ناوەکییەوە سەرچاوەبگرێ.

دووەم: سەرنج دەدەین، دادیاری داکۆکی لە رەوتی دادگاییکردنی تۆمەتپێکراو داسکۆ تادیش Dusko Tadic [١٣] دا چەند جارێ دەسکاری داکۆکینامەی خۆی لە بەردەم دایرەی یەکەمی Chamber I دادگاییکردندا کردووە کە تایبەت بووە بە حەلوفەسلکردنی دادخوازیی ناوبراوەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێ خۆی لە قەرەی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ئاسایش سەبارەت بە بریاردان لەمەڕ رەوشی یۆگۆسلافیای جاران کە داخوا هەڕەشە لە

[١٢] UNلە ساڵی ١٩٦٤دا دەستی خستە ناو قوبرسەوە، بەو بیانووە کە ململانەی نێوان تورك و یۆنانییەکانی قوبرس، لەوانەیە ببتە ململانەیەکی چەکدارانەی نێودەوڵەتی ئەگەر هەر یەك لە تورکیا و یۆنان بۆ پارستنی تایەفەکانی سەربەخۆیان بێنە ناو کێشەکەوە.
سۆمال و لیبیریا نموونەی نوێباوی مایەی خۆتێکردنی UN ن.

[١٣] کێشەی تادیش Tadic، یەکەمین کێشە بووە، خرایە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتییەوە، لەبەرئەوە دادیاری داکۆکی چەندان تانەیان سەبارەت بە دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ئاسایش و دەستدانی دادگەکەوە، بە دایرەی تیچهەڵچوونەوەی دادگە دا.

ئاشتی دەکات یان نا نەداوە، کەچی لەباری قانوونییەوە بڕوای بەو ڕێوشوێنانە نەبووە کە ئەنجوومەن گرتونیە بەر کە لە پێکهێنانی دادگەی نێودەوڵەتیدا بەرجەستە بوون[١٤].

ئایا دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش تەنیا دەبوایە لە سنوورو **جغزی** ئەو ڕێوشوێنانە دابن کە لە هەردوو ماددەی ٤١ و **٤٢دا** ئاماژەیان بۆ کراوەو هەروەکو لـە مـاددە **٣٩دا** ڕوونکراونەتــەوە، یــان ئــەوەتا ئەنجوومــەن لــە بــواری پاراســتنی ئاشــتی و تــەنایی نێودەوڵەتیدا، دەسەڵاتێکی لەمە فرەوانتری هەیە.

زۆربەی لێکدانەوەکان پێیانوایە، ئەنجوومەنی ئاسایش دەسەڵاتێکی فرەوانی لە هــەردوو بواری بڕیاردان و گرتنەبەری کارڕایی و ڕێوشوێنی لەبار هەیە[١٥]. دەقی ماددەی **٣٩** یش ڕوون و خویایە سەبارەت بە گرتنە بەری ڕێوشوێن بــە پێــی دەســتدانەکانی ئەنجوومــەنی ئاسایشی تایبەت بــە فەســڵی حەفتــەم لــە ڕێگــەی هــەر دوو مــاددەی ٤١ و**٤٢**-ەوە و لەوانەیە ماددە ٤٠یش بچێتە ناو ئەم جغزەوە کە ڕێگەچارەی فرەیان بــۆ ئەنجوومــەن بــە پێی پەیمانی UN فەراهــەمکردووە[١٦]. ئیــدی ئەنجوومــەنی ئاســایش بــۆ ڕێگــەگرتن لــە تەشەسەندنی حاڵەتیکا، دەکارێ ڕاسپاردان دەربکا، یان ئــەو ڕێوشــوێنانەی لــە مــاددە **٣٩دا** هاتوون، بگرێتەبەر و داوا لە لایەنە پێکناکۆکەکان بکا ئەو شتە بکەن کە ئەو بــە پێویستیان دەزانێ، یان هەر ڕێوشوێنێکی کاتەکی کە خــۆی بــە چــاکی دادەنــێ، دەبــێ

---

[١٤] I.C.T.Y., Deffence Brief to Support the Notice of Interlocutory Appeal, Case No: IT- 94- 1- AR 72, 25 Aug 1995, para, 5.1.

[١٥] بۆ ئەمە سەیری:

د. غسان الجندي، قانون المنظمات الدولية، مطبعة التوفيق، عمان، ١٩٨٧، ص ٤٨ وما بعدها، بکە.

[١٦] ئەم دەسەڵاتانە لە ڕاست دەوڵەتی پێشێلکاری پەیمانی نێودەوڵەتی بە زۆرن و لە ڕووی دەوڵەتانی تریشەوە بــە ناچــاری و ئیلزامین کە بە گوێرەی پابەندبوونیان بە هاریکاریکردن لە گەڵ سازمانی نێودەوڵەتیدا (بڕگە٥ی مــاددە ٢ و مــاددە ٢٥ و ماددە ٤٨ی پەیمان)، ئەندامانی UN هاریکاری یەکتر دەکەن بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی ماددە ٤٩ی پەیمانی UN بڕیاری لێداون.

ئەنجوومەنی ئاسایش، ئەگەر لایەنە پێکناکۆکەکان نەهاتن بەدەمیەوە و رەچاوی رێوشوێنەکانیان نەکرد، حسێبیی خۆی بکا [١٧].

مادده ٤١ دەڵێ: ئەنجوومەنی ئاسایش، دەشێ ئەو رێوشوێنانە بە پەسند بزانێ کە بەکارهێنانی هێزی چەکدار بۆ جێبەجێکردنی بریارەکانی ناخوازن، یان دەکارێ داوا لە ئەندامانی UN بکا ئەو رێوشوێنانە جێبەجێ بکەن کە دەشێ لە نێویاندا ئەمانە هەبن: پچڕاندنی هامشۆ و پێوەندیی ئابووری و خەتی شەمەندەفەرو هاتۆچۆی دەریایی و ئاسمانی و پۆستەو بروسکە و نا تەلی و شێوازەکانی دی گەیاندن، جا چ ئەو پچڕاندنە پاژەکی بێ، یان بە تەواوی.. هەروا برینی پێوەندیی دپلۆماتیکی.

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش سەرنجی دا رەوشێك وا دەخوازێ بۆ رێگەنەدان بە هەڕەشەکردن لە ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی هێزی سەربازی بەکاربێت ، ئەوا لەو دەمەدا ئەنجوومەن دەکارێ رێوشوێنی سەربازی بگرێتەبەر [١٨].

## ١–١–٢: دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتی وەکو رێوشوێنێك بە پێی فەسڵی حەفتەم

ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش پێیوابێ هەڕەشە لەسەر ئاشتی هەبووە، یان لادان لە ئاشتی بووە، یان دەستدرێژیی کراوە، ئەوا ئەنجوومەن دەسەڵاتێکی فرەی بێ کۆت و بەندی بە

---

[١٧] رێوشوێنە کاتەکییەکان بریتین لە هەر کارڕاییەك کە ناتەبایی نێوان لایەنە پێکناکۆکەکان بڕێنێتەوە و چ کاریان بە مافەکانی لایەنە پێکناکۆکەکان، یان داخوازییەکانیان، یان جێگەو رێگەیانەوە نییە. نموونەیان: فەرمانی تەقە راگرتن، فەرمان لێکجوێکردنەوەی هێزە سەربازییەکان. دیارە ئەم رێوشوێنانە دیاری نەکراون و ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی دەقی مادده ٤٠ ی پەیمان، دەسەڵاتی هەڵسەنگاندنی هەر بارێکی هەیە کە ئەو دەمە ئەو رێوشوێنانە لە گەڵیدا رێك دێنەوە.
د. محمد سعيد الدقاق، التنظيم الدولي، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٢، ص ٣٠٨

[١٨] دەقی مادده ٤١ ئەمەیە: ئەگەر ئەنجوومەنی ئاسایش سەرنجی دا ئەو رێوشوێنانەی دەقاودەق ناویان لە مادده ٤١ دا هاتووە، مەبەست و نیشانە ناپێکن، یان بۆی ساغ بۆوە کە ئارمانجەکە ناپێکن، دەشێ لە رێگەی هێزی ئاسمانی و دەریایی و زەوینییەوە، کاروکردەی وا پەیرەو بکا کە پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی، یان گەڕاندنەوەیان بۆ سەر باری جاران، ئەو بەکارهێنانە دەخوازێ، دەشێ ئەم کاروکردانە خۆنیشاندان و ئابلوقەو ئۆپەراسیۆنی دی بن بە هۆی هێزەکانی ئاسمانی و زەوینیی سەر بە ئەندامانی UNەوە.

گوێرەی مادده ٣٩ (لەچوارچیوەی پەیماندا) هەیە کە چ کردەیەك پێڕەوبکاو چ ڕێوشوێنێکی گونجاو وەربگرێ.

ئەنجوومەنی ئاسایش ، لە بڕیاری ٨٢٧ و[١٩] لە کاودانی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاراندا، وای حیساب کردووە کە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY، بەشداریی زڤراندنەوەی ئاشتی و تەنایی بۆ سەر باری جارانیان دەکا. ئەنجوومەن دیاریکردووە کە ئەم بڕیارە بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمان وەرگیراوە، بەڵام ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە کە کێهە مادده بووەتە بنەمای وەرگرتنی ئەم ڕێوشوێنە[٢٠].

دادیارانی داکۆکی لە قۆناخە جیا-جیاکانی دادگاییکردنی تادیشدا ، بابەتی ئەو ڕێوشوێنانەی کە ئەنجوومەنی ئاسایش پێڕەوی لێکردوون، هێناوەتە گۆڕێ، کە دەکرێ لە سێ هیم و بنەمادا پوختیان بکەینەوە[٢١]:

- ناشێ دامەزراندنی دادگەیەکی لەم بابەتە لە چوارچێوەی پەیمانی UN دا وەکو ڕێوشوێنێك بە گوێرەی فەسڵی حەفتەم وەربگیرێ. بە لگەش بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە لە ڕێساو بنەماکانی پەیماندا، نەخوازە لە هەر دوو ماددەی ٤١ و ٤٢دا، شتێ نییە ئاماژە بۆ ئەم پرسە بکا.

---

[١٩] بڕیاری ٨٢٧ی ئەنجوومەنی ئاسایش، سەرچاوەی پێشوو، کە تیایدا هاتووە:
"لە هەلومەرجی تایبەتی یۆگۆسلافیای جاراندا، دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتیی وەکو کارڕاییەکی تایبەت ad hoc measure لە لایەن ئەنجوومەنەوە، بۆ دادگاییکردنی ئەو کەسانەیە کە لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بەرپرسیارن، ئەم کارڕاییە وا دەکا ئەم ئامانجە مایەی جێبەجێکردن بێت و بەشداریی لە پاراستنی ئاشتی و گەڕاندنەوەی بۆ سەر باری جارانی بکا"

[٢٠] سەرچاوەی پێشوو، بڕیارەکە ئاماژە دەکا بۆ:
"بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەوتار دەکا"

[٢١] I.C.T.Y, Brief of Support the Motion of the Defence on the Jurisdiction of the Tribunal before the Trail Chamber of International Tribunal, Case No. IT-94-1-T, 23 June 1995, Para, 3.2.1.

- ئەنجوومەنی ئاسایش، هەروەکو لە پەیمانی UNدا جەختی لەسەر کراوەتەوە، دەستەیەکە، دەستدانی جێبەجێکاریی هەیەو مافی دەستدانی دادوەرییەکی ئەوتۆی نییە کە ڕێگەی پێبدا دەستەیەکی دادوەری دابمەزرێنێ، یان بیخاتە ئەستۆی دەستەیەکی ناسەرەکی دادوەرییەوە.

- دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت، نە ئاشتی نێودەوڵەتیی پێ پتەو دەبێ و نەدەکارێ بنەجێشی بکات بە تایبەت لە یۆگۆسلافیای جاراندا، هەروەکو بەروونی لە ڕەوشی ئەو وڵاتەدا، لە دوای دامەزراندنی ئەم دادگەیەوە، دەردەکەوێ.

ئیدی لەسەرینی ئەمەوە چارمان ناچار، هەوەڵجار دەبێ ئەو ماددەیەی نێو فەسڵی حەفتەم دیاری بکەین کە دەشێ ببتە بنەمای دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی، چونکە ئەنجوومەنی ئاسایش، هەروەکو خویایە، ڕاست و ڕەوان هیچ ماددەیەکی دیاری نەکردووە، ئەگەر ماددە ٤٢ی پەیمانمان لەولاوە دانا، چونکە ئەو ڕێوشوێنانەی بە گوێرەی ئەم ماددەیە پەیڕەو دەکرێن، سروشت و مۆرکێکی سەربازییان هەیە. هەروابێتەوە ماددە ٤٠یش، سەروکاری لە گەڵ ڕێوشوێنە کاتەکییەکاندا هەیە و کاری بە سەر دادخوازی و ستاتۆی قانوونی و مافی لایەنە پێکناکۆکەکانەوە نییە. ئەم ڕێوشوێنانە بەر لەوەی ئەنجوومەنی ئاسایش پەنا بۆ ڕێوشوێنەکانی ناو ماددە ٣٩، ببا پەیڕەویان لێدەکرێ و ئەم ڕێوشوێنانە بە گوێرەی بڕگە ٧ی ماددە ٢ی پەیمان دیاریکراون[٢٢].

ئیدی کەواتە دەکرێ بێژین ماددەی هەرە گونجاو بۆ ئەم ڕەوتارەی ئەنجوومەنی ئاسایش، ماددە ٤١-ە[٢٣].

---

[٢٢] بڕگە ٧ی ماددە ٢ی پەیمانی UN ئاماژە بۆ پرەنسیپی "دەستوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتانی ئەندام" دەکا: "لەم پەیمانەدا پاساوێك بۆ Un نییە دەست لەو کاروبارانە وەربدا کە دەکەونە دوڕ دەسەڵاتی ناوەخۆی دەوڵەتەوە، پێویستیش ناکا ئەندامان پرسگەلێکی لەم بابەتە بخەنە بەردەم (UN)ەوە تا بە گوێرەی ئەم پەیمانە چارەسەری بۆ دابنرێ، لە گەڵ ئەوەشدا ئەم پرەنسیپە ڕێگە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنەکانی داپڵۆسین کە لە فەسڵی حەفتەمدا هاتوون، ناگرێ".

[٢٣] ماددە ٤١ ئەم بڕگەیەی تێدایە: "ئەنجوومەنی ئاسایش خۆی بڕیار دەدا، کە چ ڕێوشوێنێك بۆ بەجێگەیاندنی بڕیارەکانی خۆی بگرێتەبەر کە پێویست بە بەکارهێنانی هێزی چەکدار ناکا".

وەلیّ مادده ٤١، یەکە یەکە ڕێوشوێنە ئابووری و سیاسییەکان دەژمێریّو هەرگیز قامك بۆ ڕێوشوێنی دادوەری ڕاناهێڵێ. هەروا ئەو ڕێوشوێنانەی کە ئەنجوومەنی ئاسایش پەناشیان بۆ دەبا لە بنەچەکەدا لە لایەن ئەندامان خۆیانەوە جێبەجیّ دەکرێن (ئەنجوومەن، بۆی هەیە داوا لە ئەندامانی UN بکا کە ئەو ڕێوشوێنانە بنەجیّ بکەن - مادده ٤١). ئیدی ئا ئاوا ئەو ڕێوشوێنانە لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایش خۆیەوە، نایەنە جێبەجێکردن[٢٤].

لیّ دادوەرەکانی دادگەی تێهەڵچوونەوە لە ICTY بەو دەرئەنجامە گەیشتن کە ئەو ڕێوشوێنە ئاماژەپێکراوانەی مادده ٤١، تەنیا (نموونەی ڕوونکەرەوەن) و ڕێگە لەوە ناگرن کە ڕێوشوێنی دیکەش پەیڕەو بکریّ[٢٥].

کەواتە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی بە پێی دەسەلاتەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و بە پێی مادده ٤١ی فەسڵی حەفتەم بووە.

بەلاّم داخوا ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانیّ دەستەیەکی ناسەرەکی خودان دەستدانی دادوەری دابمەزرێنیّ؟ بەڵیّ دەشیّ دەستەیەکی ناسەرەکی دابمەزرێنیّ، چونکە ئەنجوومەنی ئاسایش دەکاریّ چەندی حەز بکا دەستەی ناسەرەکی کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی، بە

---

[٢٤] I.C.T.Y, Brief of Support the Motion of the Defence on the Jurisdiction of the Tribunal before the Trail Chamber of International Tribunal, Case No. IT-94-1-T, 23 June 1995, Para, 3.2.1.

[٢٥] لە بڕیاری دایرەی تێهەڵچونەوەدا هاتووە:

تاکە شتێکی ئەم ماددەیە بیخوازیّ ئەوەیە کە هێزی چەکدار بەکار نەیەت، لەم ماددەیەدا ئەو ڕێوشوێنانە دیاری نەکراون کە دەوڵەتان ئەنجامی دەدەن، وەلیّ بە شیکارییەکی سادەی ئەم ماددەیە دەردەکەویّ کە بڕگەی یەکەمی ئەم ماددەیە، وەسفێکی گشتییە، هەندیّ جۆرە ڕیّ و شوێن ڕوون دەکاتەوە کە دەکریّ لە لایەن دەوڵەتانی ئەندامەوە بگیرێنە بەر و ئەمەش بە ڕوونی لە بڕگەی دووەمی ماددەکە دیارە کە بە "دەشیّ لە نێویاندا" نەك "دەبیّ لەمە"دەست پێدەکا. ئا ئاوا تەنانەت لە ڕووی مەنتیقیشەوە دەردەکەویّ ئەگەر بشیّ UN ڕێوشوێنیّ بگرێتەبەر و لە لایەن دەوڵەتانی ئەندامیشەوە بێنە بەجێئینان، ئەوا لە پێشەوە دەشیّ لە لایەن دەستەکانی سازمانی UN خۆیانەوە پەیڕەو بکرێن."
I.C.T.Y, Decision for Appeal on Jurisdiction , op, cit, para 35-36.

پێویستیان دادەنێ، دایمەزرێنێ. لێ ئەنجوومەنی ئاسایش دەستدانی دادوەری پێ نەدراوە تا بکارێ دەستەیەکی خودان دەستدانی دادوەری پیکبهێنێ، چونکە ئەمە پێچەوانەو دژی پرەنسیپە سەرەکییەکانی پەیمانی UN-ە، کە دەسەڵات، بەشێ لە دەستدانەکانی خۆی، لە قەبەڵ لایەنی دیکە بکا.

هەروەکو ئاماژەی بۆ کرا، وەزیفەی سەرەکی ئەنجوومەنی ئاسایش، پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتییە، سەرباری ئەوەش ئەرکگەلێکی جێبەجێکاریشی هەن. وەلێ دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی بەم مانایە نییە کە ئەنجوومەنی ئاسایش، ئەرکی دادوەری پراکتیزە بکا کە بە گوێرەی پەیمان هی دەستەیەکی تری سەر بە UN—ە ، چونکە ئەنجوومەن بە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی، دەسەلاتەکانی خۆی بۆ گەڕاندنەوەی ئاشتی و تەنایی لە یۆگۆسلافیای جاران پەیرەو دەکا.

کۆمەڵەی گشتیی UN یش، پێویستیی بە وەزیفەگەلێکی سەربازیی نییە، تا هێزێکی کتوپڕو لەناکاوی نێودەوڵەتی لە رۆژهەلاتی ناڤیندا بەیەکەوە بنێ ( UNEF لە ساڵی ١٩٥٦دا)، کۆمەڵەی گشتی، دەسەلاتی دادوەریشی نییە تا بکارێ دادگەگەلی ئیداریی سەر بە UN (UNAT) دابمەزرێنێ[٢٦].

لە بۆچوونی راوێژکارانەی دادگەی دادی نێودەوڵەتی ICJ لە دۆزی (کارکردی ئەو قەرەبووانەی کە دادگەی ئیداریی UN بڕیاریان لێدەدا)[٢٧] هاتووە:

---

[٢٦] دادگەی ئیداریی UN بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی ٣٥١ (IV) لە ١٩٤٩/١١/٢٤دا دامەزراوە.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی چوارەم، ١٩٤٩.

[٢٧] پوختەی کێشەکە ئەوەیە: داخوا دادگەی ئیداری دەتوانێ کۆمەڵەی گشتیی UN بە بڕیارێك پابەند بکاو ببەستێتەوە، بەو پێیەی دەستەیەکی لاوەکییە کە کۆمەڵەی گشتی خۆی دایمەزراندووە.
I.C.J جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە بڕیارەکانی دادگەی ئیدارەی هێزی ئەو شتەی بڕاوەتەوە هەیە و ئیدی نەتەوە یەکگرتووەکان پابەندە بە بەجێگەیاندنی.
I.C.J, Effect of Awards of Compansation made by the United Nations Adminstrative Tribunal,
advisory opinion, 31 July 1953, I.C.J Reports 1954, pp.47-97.

(پەیمانی UN، هیچ ئەرکێکی دادوەری لە قەبەڵ کۆمەڵەی گشتی نەکردووەو رێگەی دامەزراندنی دادگەی ئیداریشی لە دوتوێی ئەرکەکانیدا پێ نەدراوە، لێ بە پێی پەیمان بۆ رێکخستنی پێوەندیی نێوان کارمەندەکانی خۆی، دەسەڵاتەکانی خۆی پراکتیزە دەکات ).

## ١–١–٣: دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی بە پشتبەستن بە قانوون

پرسیارێك دێتە گۆڕێ کە داخوا دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی لە گەڵ ئەو پرەنسیپە سەرەکییانەی کە بە (پشتبەستن بە قانوون) دادگەی نیشتمانیان پێ دادەمەزرێ، دژە.

واتە دەبێ تۆمەتی تاوانکاری لە بەردەم دادگەیەکدا کە بە پێی قانوون دامەزرابێ Established by Law دژ بە تۆمەتپێکراو بخرێتە روو. ئەم مافە لە دۆکیومێنتگەلی نێودەوڵەتی پشتڕاست کراوەتەوە[٢٨].

ئیدی دەبێ بۆ حەلوفەسلکردنی هەر بابەتێکی تاوانکاری، وەکو مافێکی تۆمەتپێکراو، دادگەیەکی دامەزراو بە پێی قانوون، سەیری تۆمەتەکەی بکا، بەو پێیەی پرەنسیپەکانی

---

[٢٨] بڕگەی ١ی ماددە ١٤ی رێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان دەڵێ:
"هەمووان لە بەرانبەر دادگەدا وەکیەکن، هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە بۆ حەلوفەسلکردنی تۆمەتێکی تاوانکاری کە ئاراستەی ئەو کراوە، یان سەبارەت بە ماف و پابەندبوونەکانی لە کێشەیەکی قانوونیدا، دادگاییەکی بە ئاشکراو عادیلانە بکرێ بە هۆی دادگەیەکی تایبەتکارو سەربەخۆو بێلایەن و دامەزراو بە پێی قانوون... ".
دەکرێ هەمان بنەمای هاوشێوە لە بڕگە ١ی ماددە ٦ی پەیمانی ئەورووپی مافەکانی مرۆڤ ببینینەوە کە دەقاو دەق دەڵێ:
"هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە لە کاتی تێڕوانینی تۆمەتێکی تاوانکاری کە ئاراستەی ئەو کراوە، یان سەبارەت بە ماف و پابەندبوونەکانی لە کێشەیەکی قانوونیدا، دادگاییەکی بە ئاشکراو عادیلانە لە کاتێکی دیاریکراودا بکرێ بە هۆی دادگەیەکی تایبەتکارو سەربەخۆو بێلایەن و دامەزراو بە پێی قانوون... ".
هەروا بڕگەی ١ی ماددە ٨ی پەیمانی ئەمریکایی بۆ مافەکانی مرۆڤ دەڵێ: هەر کەسێ مافی لە دادگایەکدا... بە پێی قانوون دامەزراو بێ" .

قانوون هەروەکو دەقی مادده ٣٨ی پێڕەوی ئەساسیی I.C.J هێمایان بۆ دەکا، بەشێکن لە قانوونی نێودەوڵەتی[٢٩].

ئەم چەمکە لە دۆکیومێنتە ئاماژەپێکراوەکاندا، تەنیا لە سیستەمگەلی قانوونیی نیشتمانیدا جێبەجێ ناکرێ بەڵکە لە دادگەگەلی نێودەوڵەتیشدا[٣٠].

لێوەکۆڵێن لە زاراوەی ( بەگوێرەی قانوون) سێ لێکدانەوەی بنچینەیی لێدەکەوێتەوە:

یەکەم: ئەمەیان لە دۆزی تادیشدا Tadic هێنرایە گۆڕێ کە دەبوایە دەستەیەکی قانووندانان، **دادگەی نێودەوڵەتی** I.C.T.Y ی دابمەزراندایە، کەچی دادگەی نێودەوڵەتی لە ئاکامی بڕیارێکی جێبەجێکاریی رووتدا Mere Executive هاتۆتە بوون، نەك

---

[٢٩] مادده ٣٨ی پێڕەوی ئەساسیی I.C.J دەڵێ: "ئەرکی دادگە بریتییە لە یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەی دەخرێنە بەردەمیەوە بە پێی بنەماکانی قانوونی نێودەوڵەتی کە لەمبارەوە پەیرەو دەکرێن".

لە يرطەی ج دا هاتووە: ترەنسيئە طشتييەكا قانوون كە نەتەوە شارستانييەكان بڕياريان لێداوە و ئەسنديان كردووە"

[٣٠] بیروڕای فیقهی جودا سەبارەت بە دیاریکردنی ناوەڕۆکی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش لە ئارا دان. قانوونزانی وا هەن پێیان وایە ئەم بڕیارانە خۆبەخۆ و راستوخۆ و هەر لەجێوە، توانای بەرهەمهێنانی شوێنەواری قانوونی پابەندکارانەیان هەیە، ئەگەر بڕیاری تاین هەموو توخمەکانی بڕیاری تێدا مەیسەر بووبێ کە وا دەکەن خۆی لە خۆیدا بکەوێتە واری جێبەجێکردنەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ توخمێکی تری دەرەکی بۆ زێدە بکرێ و ئیدی ئا ئاوا ئەم بڕیارانە رێساگەلێکی گشتی و رووتی رەوتارکردن دەچەسپێنن، واتە رێساگەلێکی قانوونیانە بە مانای وردی قانوون جێگیر دەکەن.

دەستەیەکی تر هەن پێیان وایە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش پلەو پایەکیان هەس، وەلێ کەمتر لەوەی کە ببنە بنەمایەکی قانوونیانە. کەواتە نزیکە"قرینە" یەکی قانوونیانە لە سەر رەوابوونی رەوتارێك کە لە گەڵ نێوەڕۆکەکەیدا بگونجێ، دەگورێنێ ، ئەمە بەو مانایە نییە کە دەوڵەتان پشتگوێیان بخەن، بە لکە یان ئەوەتا دەبێ جێبەجێیان بکەن، یان ئەوەتا دەبێ پاساو بۆ جێبەجێ نەکردنیان بدۆزنەوە و لە هەموو بارێکیشدا ناتوانن بە پێچەوانەوەی ئەو سەمتە بناژۆن کە بڕیارەکە خواستوویە.

تێبینی دەکرێ کە ئەنجوومەنی ئاسایش – سەبارەت بە پراکتیزەکردنی دەستدانەکانی خۆی بۆ پاراستنی ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی- دەسەڵاتی دەرکردنی بڕیارگەلێکی هەیە کە پابەندبوونی قانوونییان تێدایە. بۆ زیاتر زانیاری و سۆسەکردن سەبارەت بە بیروبۆچوونی فیقهی لە مەڕ دیاریکردنی ناوەرۆکی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش و بایەخی قانوونیی بڕیارگەلی سازمانە نێودەوڵەتییەکان، بگەڕێوە بۆ:

د. محمد سعيد الدقاق، النظرية العامة لقرارات المنظمات الدولية ودورها في ارساء قواعد القانون الدولي، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٧٤.

د. محمد سامي عبدالحميد، قانون المنظمات الدولية، مؤسسة شباب الجتمعة، ١٩٧٢.

بریارێك كە لە ژێر چاوەدێرییەكی دیموكراتیكدا، تۆمەتپێكراو راكێشێتە بەردەم دادگە. ئەمە لە رووی داهێنانی رێكخستنێكی دادوەری لە كۆمەڵگەیەكی دیموكراتدا پێویستە. ئیدی لە سەر ئەم بنەمایە، دادگەی نێودەوڵەتی بە پێی قانوون دانەمەزراوە.

وەلێ دابەشكاریی دەسەڵاتەكانی دادوەری و قانووندانان و جێبەجێكاری كە لە سیستەمی نێوخۆییدا پەیرەوی لێدەكرێ، لە باری نێودەوڵەتیدا ، بەتایبەتیتر لە باری رێكخراوێكی نێودەوڵەتیی وەكو UN دا، كاری پێناكرێ[31].

ئەمە لە كاتێكدا زاراوەی ( بە گوێرەی قانوون) لە پەیمانی ئەوروپیدا دەربڕینێكی بە جیا هەڵكەوتووی هەیە، چونكە ماناگەلێك بە خۆوە دەگرێ كە جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە دادگە لە كۆمەڵگەی دیموكراتدا، لە رەوتارو بڕیاروەرگرتندا، ئازادو دەستی كراوەیە، لێ دەبێ ئەو دادگەیە بە پێی قانوونێك كە پەرلەمان خۆی دای نابێ، دابمەزرێ[32].

هەرچی دابەشكاریی فەرمانی دادوەری و یاسادانان و راپەراندنە لە نێوان دەستە سەرەكییەكانی UN دا، وەزیفەی دادوەری لێدەرچێ، ئەوا بە شێوەیەكی بنبڕ خویا نییە. چونكە I.C.J دەستەی دادوەریی سەرەكییە (مادده /٩٢)[33]. وەلێ لە سیستەمی

---

[31] I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 42.

[32] دادگەی ئەورووپایی بۆ مافەكانی مرۆڤ دیاری كردووە:

"بۆ ئەوەی دادگەیەك بتوانێ سەیری كێشەیەك كە خراوەتە بەردەمی بكا، دەبێ بریار بدرێ كە داخوا دادگەكە بەپێی قانوون دامەزراوە، دیاری كراوە كە دادگەكە بە پێی مادده ٩٨ی دەستووری بەلجیكا دامەزراوە".

Eur. Comm. H.R, Piersack v. Belgium, App. No. 86932/79, 47(ser. B), 1981, p.12.

بە هەمان مانا:

Eur. Comm. H.R, Zand v Aurtria, App. No. 7360/76, Dec, A report 70, 1979, p.80.

[33] مادده ٩٢ دەڵێ:

"دادگەی دادی نێودەوڵەتیی، دەستاوێژێكی دادوەریی نەتەوە یەكگرتووەكانەو بە پێی پێڕەوی ئەساسیی پاشبەندی ئەم پەیمانە، كاری خۆی دەكا و لەسەر بنەمای پێڕەوی ئەساسیی دادگەی هەمیشەیی دادی نێودەوڵەتیی دارێژراوەو بەشێكی جیانەكراوەی ئەم پەیمانەیە".

نێودەوڵەتیدا، دەستەیەکی یاسادانان پڕ بە پێستی مانای وردو تەواوی زاراوەکـە، نییـە. بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، پەرلەمانی نییە.

وەکو ئاشکرایە، ناشێ و ناکرێ ئەو دابەشکارییەی لە سەرەوە باسکراو لە بنەچەکەدا لـە قانونگەلی نیشتمانیی دەوڵەتاندا کەوتووەتەوە، لە دەسـتەکانی UN یشـدا کـاری پـێ بکرێ. ئەم دابەشکارییە ناشێ بەسەر رەوشی نێودەوڵەتیـدا بـە گشـتی پـەیرەو بکـرێ، بەڵکە وەزیفەو پابەندبوونی تایبـەتیی سیسـتەمگەلی نیشـتمانی، ئـەم دابەشـکارییەی هێناوەتە ئاراوە[٣٤].

دووەم: دەشێ لێکدانەوەی زاراوەی (بەگوێرەی قانوون) هێما بێ بۆ دامەزراندنی دادگـەی نێودەوڵەتی لـە ئـالی لایـەنێکی نـا پەرلەمانییـەوە، وەلێ ئـەم لایەنـە، دەسـەلاتێکی دیاریکراوی ئەوتۆی هەیە کە هێزی پابەندبوونی هەیـە. لـەم تێڕوانینـەوە، ئەنجوومـەنی ئاسایش لە دوتوێی پەیڕەوکردنی دەسەلاتەکانی خۆیدا، بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی ئێستای UN، ئەوا بریارگەلێکی پابەندکار وەردەگرێ. ئەمەش لـە دەقـی مـاددە ٢٥ی پەیماندا خویاو ئاشکرایە[٣٥]. سەرباری ئەوەش دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی لە لایـەن کۆمەڵەی گشتیی UN ەوە کە بەشداریی لە هەڵبژاردنی دادوەرەکانی دادگەو پەسندکردن و راستاندنی بودجەکەی دەکات، پەسند کراوە[٣٦].

---

[٣٤] I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 43.

[٣٥] ماددە ٢٥ی پەیمانی UN دیاریکردووە کە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵێن دەدەن بە پێی ئەم پەیمانە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش پەسند و جێبەجێ بکەن.

[٣٦] بگەڕێوە بۆ بڕگەی ٢ی ماددە ٣٢ ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سکرتێری گشـتی ، سەرچاوەی پێشوو.

هەروا کۆمەڵەی گشتی لە چەندین بڕیارو بۆنەدا، رازیبوونی خۆی لە کاری دادگەی نێودەوڵەتی نیشانداوە و هانی داوە.

لەمبارەوە سەیری بریارەکانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان بکە:

U.N.G. A Res. 48/88, 20 Dec, 1993.
U.N.G. A Res. 98/193, 20 Dec, 1993.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی ٤٨، ١٩٩٣.

سێیەم: لێکدانەوەی دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی (بەپێی قانوون) ئەوەیە کە دەبێ ئەم دامەزراندنە بە پشتبەستن بە بنەماکانی قانوون بێ. رەنگە ئەم مانالێدانەوەیە لە هەمووان زێتر جێگەی پەسندکردن و نزیکتر بێ لە قانوونی نێودەوڵەتی، ئەم مانایە ئەو گەرەنتییانەی کە دەبێ لە دادگەیەکی نێودەوڵەتیدا دابین بن، دەردەبڕێ[٣٧].

گرنگ لە تێڕوانین بۆ دامەزراندنی دادگە (بەپێی قانوون)، یان دادگەیەك کە بە گوێرەی قانوونێکی پێشتر هەبوو، پێکهاتبێ، یان دادگەیەك کە بۆ بارێکی دیاریکراو، یان بۆ مەبەستێکی سنووردار دامەزرابێت، ئەوەیە کە دادگە لە لایەن دەستەیەکی تایبەتکار هاتبێتە ئاراو بە پێی کارڕایی قانوونی گونجاوو بە لەبەرچاوگرتنی بایەخە پێویستییەکانی دادگەرییەوە بووبێت.

---

هەروا هەر دوو بڕیاری:

U.N.G. A Res. 49/10, 8 Nov. 1994.
U.N.G. A Res. 49/205, 23 Dec, 1994.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی ٤٩، ١٩٩٤.

[٣٧] شایانی گوتنە، هەندێ هەوڵ بۆ هەمواركردنی (پرۆژەی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان) دراوە. بە پێی ئەم هەمواره دەبێ دادگە (بە پێشوەختە بە پشتبەستن بە قانوون Pre- established by Law) دابمەزرێ نەك بە (پشتبەستن بە قانوون)، ئەم دوو پێشنیارە، لە لایەن نوێنەری لوبنان و چیلی پێشکەشکران و ئەگەر بڕیاریان لێبدرایە ئەوا رێگە لە دادگەگەلی تایبەت دەگیرا. لەم رەوتەدا، نوێنەری فلیبین بێهودەیی ئەم پێشنیارەی لوبنان و چیلی روونکردەوە کە : ئەگەر پێشنیاری لوبنان و چیلی پەسند بکرێ، ئەوا دەوڵەتان ناشێن دادگەکانی خۆیان رێکبخەنەوە، داخوا دەشێ داوا بکەین کە دادگەی نۆرمبێرگ بوونی نییە لە کاتێکدا تاوانبارانی شەڕ، تاوانی خۆیان کردووە.

U.N. Economic and social Council, Commission of Human Right, 5th, Sess, E/CN.4/SR.109, Sum. Rec., 8 June 4, Doc.6.

هەرچی بە دادگە تایبەتیەکانیشەوە بەندە" ئەوا ئەرك و وەزیفەیان، ئاکامی هەلومەرجێکی نا ئاساییە و دەبێ دادگاییکردنی تۆمەتپێکراوان لەو دادگایانەدا، لەسەر بنەمای دادگاییکردنێکی عادیلانە و بە گەرەنتیی دیاریکراوەوە بەرێوە بچێ[38].

ئەگەر پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی، بنەماکانی دادڕەوییو بنەماکانی سەلماندن Rules of Procedure and Evidence کە دادوەرانی دادگەکە خۆیان بە پشتبەستن بە پێڕەوی ئەساسی پەسندیان کردوون، بپشکنین[39]، دەبینین ئەم بنەما و رێسایانە بە پشتبەستن بە بنەماکانی قانوون دامەزراون و ئەو گەرەنتییە ئەساسییانەی لە بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا هەن، دابینکراون[40].

دیماهی ئایا ئەنجوومەنی ئاسایش هەوڵی داوە دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاری دابمەزرێنێ کە دەسەڵاتێکی گشتی هەبێ و تاوانگەلی تاوانکارە نێودەوڵەتییەکان ، لەناوەوەو دەرەوەی هەرێمەکانی دەوڵەتانی ئەندامی UN دا بگرێتەوە؟

---

[38] ئا ئەمە لێکدانەوەی لیژنەی مافەکانی مرۆڤە/نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ زاراوەی ( بەپشتبەستن بە قانوون) و ئەو مەبەستەیە کە لە ماددەی ١٤ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا جێگەی بۆ کراوەتەوە، لە هەموو بارێکدا، دەقەکانی ئەم ماددەیە دەبێ هەموو دادگاکان چ تایبەت بن، یان ئاسایی جێبەجێیان بکەن.
U.N. H.R. Comm., General Comment on Article 14, 43rd sess., Supp. No. 40, 1988, Doc. A/43/40, para 4.
U.N. H.R. Comm., Cariboni v. Uruguay 159/83, 39rh Sess., Supp No. 40, 1894, Doc. A/39/40.

[39] تابلۆی رێساگەلی دادڕەویی و رێساگەلی سەلماندن کە دادوەرانی دادگەی نێودەوڵەتی بە گوێرەی ماددە ١٥ی پێڕەوی ئەساسی لە ١١/٢/١٩٩٤دا پەسندیان کردوون، دواتر چەند جارێ دەسکاری کراون.
I.C.T.Y, Buletin of I.C.T.Y, Publication of the Tribunals Registry, the Hugue, No. 1, 15-12-1995, p.1.

[40] ئەو گەرەنتییانەی لە ماددە ١٤ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا هاتوون، لە ماددە ٢١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیشدا هەن.

دیارە ئەنجوومەنی ئاسایش، دادگەیەکی دامەزراندووە کە سروشتێکی بەرتەسکی هەیە، هەم بۆ مەبەستێکی دیاریکراو، هەم کاتەکی و تایبەت بە چەند تاوانێکی دیاریکراوەوەیە کە لە هەرێمەکانی یۆگۆسلاڤیای جاراندا، ئەنجامدراون. بڕیارەکەش بە پێی دەسەلاتی ئەنجوومەنی ئاسایش و بە گوێرەی ماددە ٤١ بووە[٤١].

وەکو تێبینی دەکرێ، وێڕای کە ئایدیای دادگەگەلی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت، بە بیروڕای هەندێ لە دەوڵەتان بەجێ‌وڕێ بووە، کەچی لەبەر چەند هۆیەك، دەوڵەتانێکی دی لە دژی پەنابردنە بەر دادگەگەلی تایبەت بوون، گرنگترینیان:

- دادگەگەلی نێودەوڵەتیی تاوانگریی تایبەت، وەلآمدەرەوەی رەوشێکی دیاریکراوە، ئیدی رێی تێدەچێ ئەم رەوشە کار لە ئەندامانی دادگەکە بکاو کەمتەرخەمی لە پابەندبوون بە بنەماکانی بابەتخوازی و دەسپاکی رووبدا.
- پەنابردن بۆ دادگەگەلی تایبەت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی لەوانەیە نموونەیەکی خراپ بێ کە زیان بە مافەکانی مرۆڤ و سەروەریی قانوون بگەیەنێت.
- شوێنەواری بەرپەرچدەرانەی دادگەگەلی تایبەت: دیارە پێکهێنانی دادگەو دەستبەکاربوونی کاتێکی پێدەوێ، ئیدی شوینەواری بەرپەرچدانەوە لەم سێ‌ودوونەکردنەدا دەردەکەوێ کە کۆمەڵەی گشتی و ئەنجوومەنی ئاسایش بەروونی جەختی لەسەر دەکەنەوە سەبارەت بە لێوەکۆڵین لەو تاوانانەی لە رەوشێکی دیاریکراودا ئەنجامدراون. کەواتە پێویست بە پێکهێنانی دامەزراوگەلێك ناکا کە لە وانەیە لەباری قانوونییەوە ببتە مایەی تانەلێدان.

---

[٤١] دایرەی تێهەڵچونەوە لە ICTY لە کێشەی تادیشدا لەمەڕ تانەکانی دادیاری داکۆکییەوە سەبارەت بە دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتی ئەم بڕیارەی دا:

وەکو دەرەنجامێك، دایرەی تێهەڵچوونەوە پێی وایە دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتی کارڕاییەکی لەبارە بە گوێرەی پەیمانی UN و هەر شتێکی پێویست بە پاراستنی تێدایە لە پێناو دادگاییکردنێکی عادیلانەدا کە بە پشتبەستن بە قانوون دامەزرابێت.

I.C.T.Y, Decision for Appeal on Jurisdiction, Op. Cit, Para. 47.

- دەشێ تاکە دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی گشتی بۆ رووبەرووبوونەوەی تاوانە نێودەوڵەتییەکان، مەبەست و نیشان بپێکێ.
- مەترسیی مایەی خۆتێکردنی دەوڵەتان ( زلهێزەکان) لە کاروباری نێوخۆی وڵاتاندا لە ژێر پەردەی دادگەلی تایبەتدا[٤٢].

### ١-١-٤: بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش

دوای خستنەڕووی دەسەلاّت و دەستدانەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی فەسڵی حەفتەم و پاساودانەوەی پێکهێنانی دادگەی نێودەوڵەتی، دەبێ گرنگترین ئەو بڕیارانەی ئەنجوومەنی ئاسایش کە پێوەندییان بە پێشێلکارییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆییەوە هەیە و بەسەریەکەوە بنەماو قورسایی قانوونیانەی پێکهێنانی دادگەی نێودەوڵەتی بوون، بێنینە بەرباس.

- ئەنجوومەنی ئاسایش ململانەو کێشەی چەکداریی لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا لە دەسپێکی ململانەکەوە بە یەك ململانە ئەژماردووە. لە یەکەمین بڕیاردا، بڕیاری

---

[٤٢] بە هەر حاڵ، وا بە باش دەزانرێ لە تێڕوانینێکی نموونەییەوە، دەوڵەتان پەنا بۆ دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی هەمیشەیی ببەن، کە بە هۆی رێککەوتننامەیەکی چەند قۆڵی و لە ژێر سەرپەرشتیی UNدا دابمەزرێ، خۆزگە ئەو بەڵێننامە نێودەوڵەتییانەی سەروکاریان لەگەڵ تاوانە نێودەوڵەتییەکاندا هەیە، دەقی ئاشکرایان تێدا بوایە و پەنابردن بۆ دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکارییان بە ناچاری دابنایەو رێوشوێنەکانی پەنابردن بۆ ئەم لایەنە دادوەرییە تایبەتکارەیان دیاری بکردبایە و ئەو دەوڵەتانەی کە رێککەوتننامەیان مۆر کرد با، پابەند بکردایە کە رێز لەو بڕیارە بگرن کە دادگەکە دەریدەکا.

د. مرشد السید و د. نزار عەنبەکی، ئایدیای نەدانی دەسەڵات بە ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتی، یان دەزگایەکی دادوەری دووپات دەکەنەوە.

لەکاتێکدا، پرۆفیسۆر خەلیل حەدیسی پێی وایە ( دەزگای دادوەری لە خراپترین باردا، لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش باشترە).

بیروبۆچوونی فیقهی لە وتووێژی تێزی دکتۆرای قوتابی ئوسامە ئالوسیدا هاتوون لە ١٩٩٧/٤/٨ کۆلیجی قانوون- زانکۆی بەغدا.

٧١٣ی ١٩٩١/٥/٢٥، دەبینین ئەنجوومەنی ئاسایش (نیگەرانیی خۆی لە هەمبەر ئەو کوشت و کوشتارەی لە کرواتیا بەرپابووەو بەردەوامە، دەردەبڕێ و، بڕیار دەدا چی دی چەك و چۆڵ بۆ هەرێمی یۆگۆسلافیا نەنێردرێ و ئەو قەدەخەکارییە بێتە جێبەجێکردن و، بڕیاری دا کە ڕەوشی ئێستا هەڕەشەیە بۆ سەر ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی).

- لە بڕیاری ٧٥٧ی ١٩٩٢/٥/٣٠دا، ئەنجوومەنی ئاسایش ئاماژە بۆ بەیەکداچوونی ڕووداوەکان لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا دەکا و دەڵێ دەبێ وەکو یەك ململانە سەیری بکرێ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە لە نێو ئەم پێکهاتە ئاڵۆزەی ڕووداوەکاندا، هەموو لایەنەکانی یۆگۆسلافیای جاران، بەشێکی بەرپرسیارێتیی ئەم ڕەوشەی ئێستا، لە ئەستۆ دەگرن، هەروا ئەنجوومەن، حوکمگەلی فەسڵی حەفتەم و بەردەوامبوونی دەوری کۆمەڵەی ئەورووپی لە نەخشەدانان و کارکردن دەهێنێتەوە یاد لە پێناو چارەسەرێکی بە ئاشتییانەی کێشەکە لە بۆسنیا و هەرسك لە پاڵ کۆمارەکانی تری یۆگۆسلافیادا، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕەوشی یۆگۆسلافیای جاران هەرەشەیە بۆ سەر ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی.

- لە بڕیاری ٧٦٤ی ١٩٩٢/٧/١٣دا، ئەنجوومەنی ئاسایش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەموو لایەنەکانی ململانە، دەبێ پابەند بن بە ڕێزگرتن لە پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکانی خۆیان بە تایبەتی ڕێککەوتننامەکانی ١٩٤٩/٨/١٢ ی جنێف و ئەو کەسانەش کە سەرپێچیی گەورەیان دەرهەق بە ڕێککەوتننامەکانی جنێف کردووە، بەرپرسیارێتیی تاکە کەسییان سەبارەت ئەم بابەتە سەرپێچییانە دەکەوێتە ئەستۆ.

- لە بڕیاری ٧٨٠ی ١٩٩٢/١٠/٦دا، ئەنجوومەنی ئاسایش یەکەمین هەنگاوی بۆ داسەپاندنی ڕێزگرتن لە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی هەڵێنایەوە و تیایدا داوای لە سکرتێری گشتیی UN کرد کە لیژنەیەکی بێلایان لە پسپۆڕان بۆ پشکنین و

شیکردنەوەی ئەو زانیارییانەی لە بڕیاری ٧٧١دا چەسپێنراون، پێکبهێنێ[٤٣]، لە تەك زانیاریگەلێکی تردا کە لیژنەکە خۆی لە کاتی لێکۆڵینەوەدا، یان بە هەوڵوتەقەلای خۆی، یان لە ڕێگەی خەڵکی دیکەوە، یان ڕێکخراوەکانی ترەوە بە پێی بڕیاری ٧٧١ بەدەستیان دێنێ ، هەروا پێشکەشکردنی راپۆرتێکی هەمەگیری بە بەڵگەوە سەبارەت بە پێشێلکاریی دەرهەق بە ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩جنێف و پێشێلکارییەکانی تری قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بۆ سکرتێری گشتی[٤٤] UN.

---

[٤٣] لە بڕیاری ٧٧١ی ڕۆژی ١٩٩٢/٨/١٣ی ئەنجوومەنی ئاسایشدا هاتووە کە "ئەنجوومەنی ئاسایش ئەو پەڕی نیگەرانی خۆی لەمەڕ ئەو راپۆرتانە دەردەبڕێ کە پەیتا پەیتا سەبارەت بە پێشیلکاریی بەربڵاوو بەردەوامی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بە تایبەتی لە بۆسنیا و هەرسك پێیدەگەن. ئەم راپۆرتانە زانیارییان لە بارەی راگوێزانی بە کۆمەڵ و وەدەرنانی خەڵکی سڤیل لە جێگەو ڕێگەی خۆیان و زیندانی کردن و ئەشکەنجەدانی جەستەیی (لە مەڵبەندەکانی گرتن) و بە ئانقەست دەستوەشاندن لە کەسانی ناجەنگاوەر و تێسرەواندنی خەستەخانە و ئەمبلانس و ڕێگەگرتن لە گەیاندنی خۆراك و یارمەتی پزیشکی و پرکێشیکردن لە تێکوپێکدان و کاولکاریی بە ئانقەست، تێدایە. هەروا ئەنجوومەن لە بڕیارەکەیدا داوای لە تێکڕای دەوڵەتان و ڕێکخراوە مرۆییەکان کردووە کە لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و پێشێلکارییەکانی تری قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی ئاگاداری بکەنەوە. ئەمە سەرباری هەستکردنی ئەنجوومەن کە پێویستە لە کاتی دیاریکراودا ڕێ و شوێن و تەگبیری دی پەیرەو بکرێ.

وەکو تێبینی دەکرێ ئەنجوومەنی ئاسایش بەرە بەرە، وەلێ بێهودە، هەوڵی داوە سەرنج بۆ پێشێلکارییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی لە یۆگۆسلافیای جاراندا رابکێشێت.

[٤٤] بە گوێرەی بڕگە ٣ی بڕیاری ٧٨٠، سکرتێری گشتی لە ١٩٩٢/١١/١٤دا راپۆرتێکی بە ئەنجوومەنی ئاسایش داوە و تیایدا هێما بۆ بڕیاری دامەزراندنی کۆمیسیونێکی (٥) ئەندامی کارناسان Commission of Experts دەکا.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٧، پاشکۆی مانگەکانی تشرینی یەکەم و تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم، دۆکیومێنتی .S/24657

لە ١٩٩٢/١٠/٢٦دا، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ناوی سەرۆك و ئەندامانی کۆمیسیۆنەکەی راگەیاند:

Pro. Frists Kalshoven (chairman)هۆلەندا

Wiliam J. Fenrickکەنەدا

Judge Keba Mbayeسەنگال

Prof. M. Cherif Bassiouniمیسر

Prof. Torkel Ohalhنەرویج

بە نامەیەك لە ١٩٩٣/٢/٩دا، سکرتێری گشتی، راپۆرتی یەکەمی کۆمیسیۆنی کارناسانی بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش ناردووە کە تیایدا هاتووە:

بەپشتبەستن بەم باکگراوندە، ئەنجوومەنی ئاسایش ، دوای ئاماژەکردن بە بڕیارەکانی ٧٦٤، ٧٧١، ٧٨٠، بەبەرچاوگرتنی راپۆرتی یەکەمی لیژنەی پسپۆڕان، بڕیاری ٨٠٨ی ١٩٩٣/٢/٢٢ دا.

ئەنجوومەن بڕیاری دا کە لە سایەی کاودانی تایبەتی یۆگۆسلافیای جاراندا، دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتی، ئاشتی و تەنایی دەگێڕێتەوە بۆ سەر باری جاران[٤٥].

---

"کۆمیسیۆن بەو دەرەنجامە گەیشت کە پیشێلکاریی زل و زەق و پێشێلکاریی تری قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا روویداوە لەوانە: کوشتنی بە ئانقەست، پاکتاوکردنی رەگەزی Ethinic Cleaning ، کوشتنی بە کۆمەڵ، ئەشکەنجەدان، دەستدرێژیکردنە سەر ناموس، تاڵان و بڕۆو رووتکردنەوە، تێکوپێکدانی موڵك ومالّی خەڵکی سڤیل، تێکوپێکدانی موڵکی کولتووری و ئایینی، رەشبگیریی سەرەڕۆیانەی خواسایی". لە راپۆرتەکەیاندا کۆمیسیۆنەکە نیشانی داوە "ئەگەر لەم کێشەیەدا، ئەنجوومەنی ئاسایش، یان هەر دەستەیەکی تری بە دەسەڵات، دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تایبەت دابمەزرێنێ، دەبێ ئەم بڕیارە هاوئاهەنگ بێ لە گەڵ سەمت و ئاقاری کارەکەیدا".

U.N, First Interm Report of Commission of Experts (Yugoslavia), 9/2/1993, Doc. (S/25274).

[٤٥] بە پێی بڕگە ١ی بڕیاری ٨٠٨، ئەنجوومەنی ئاسایش، بڕیاری داوە دادگەیەکی نێودەوڵەتی دابمەزرێنێ بۆ دادگاییکردنی ئەو کەسانەی لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بەرپرسیارن کە لە ساڵی ١٩٩١-ەوە لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون.S

بەگوێرەی بڕگە ٢ی ئەم بڕیارە، ئەنجوومەنی ئاسایش داوای لە سکرتێری گشتی کردووە کە (ئەگەر دەکرێ بە زووترین کات لە ماوەی ٦٠ رۆژ زێتر نەبێ)، راپۆرتێکی پێشکێش بکاو هەموو لایەنەکانی ئەم پرسەی تێدا روون بکاتەوە، بە پلانێکی سەرەتایی وردی پشتئەستوور بە بیرۆبۆچوونی لەباریشەوە سەبارەت بە جێبەجێکردنی بلەزو کارای بڕیاری (دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی) بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشنیارانەی لە لایان دەوڵەتانی ئەندامەوە پێشکێشی دەکرێن.

بەکردەوە سکرتێری گشتیی لە ١٩٩٣/٥/٣دا راپۆتێکی دا و تیایدا دیاریکرد کە (ئەنجوومەنی ئاسایش لە بڕیاری ٨٠٨ بڕیاری داوە دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت ad hoc لە چوارچێوەی ئاقارو مەوداو مەبەستێکی دیاریکراودا دابمەزرێنێ، ئەویش دادگاییکردنی ئەو کەسانەیە کە لە پیشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی لە یۆگۆسلافیای جاراندا بەرپرسیارن، بڕیارەکە بۆ دامەزراندنی دادوەرییەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی بە شێوەیەکی گشتی، یان بۆ دروستکردنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی هەمیشەیی نییە، ئەم پرسەی دیماهی هێشتا لە بندەستی لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتی و کۆمەڵەی گشتی دایە).

هەروا بێتەوە سکرتێری گشتی لە راپۆرتەکەیدا، ئەو لایەنانەشی روونکردەوە کە پێوەندییان بە باکگراوندی بابەتەکەوە هەیە لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە بگرە تا دانانی گەڵاڵەنامەیەکی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی و سەرنج و تێبینی لە سەر دادگەکە.

نةتةوة يةكطرتووةكان، راثؤرتى ١٩٩٣/٥/٣ى سكرتَيرى طش ، سةرضاوةى ثَيشوو.

له راپۆرتی سکرتێری گشتیدا ئەوە دەخوێندرێتەوە، کە مەترسییەك با چکۆلەش بێ لە دامەزرانی دادگەیەکی نێودەوڵەتیدا هەبووە[٤٦].

دوای تێپەڕبونی ٤٨ ساڵ بەسەر دامەزرانی رێکخراوی نێودەوڵەتیدا [مەبەست UN-ە]،ئەگەر گەلاڵەنامەی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی (هەمیشەیی) لێ دەربکرێ، دەنا هەوڵوکۆششێکی جیدی بۆ پێکهێنانی دادگەگەلێکی لەم بابەتە لە ئارادا نەبووە.

---

[٤٦] تێبینی ئەو ترس و بیمە لەوەوە دەکرێ کە ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی بڕیاری ٨٠٨ داوای لە سکرتێری گشتی کردووە، ئەو پێشنیارانە بە هەند وەربگرێ کە دەوڵەتانی ئەندامی UN پێشکەشیان کردووە، بە تایبەتی ئەو پێشنیارانەی لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا خرابوونە روو.

چەند دەوڵەتێك لەمبارەوە پێشنیاریان بە سکرتێری گشتی دا، وەلێ گرنگترینیان لە فەرەنسا و ئیتالیاو سوید (بەو پێیەی سەرۆکی کۆنگرەی ئاشتی و هاریکاری لە ئەورووپا بوو C.S.C.E)بوون.

بۆ ئەم دۆکیومێنتانە بگەڕێوە:

U.N, Report of the Committee of Jurists Submitted by France, Official Records of Security Council, Forty-seven year, supp. For Jan., and March 1993, Doc. (S/25266).

1- U.N, Report of the Committee of Jurists Submitted by Italy, Ibid. Doc. (S/25300).

2- U.N, Reports Submitted by the permanent representative of Sweden of behalf of chairman in-office of C.S.C.E, Ibid. Doc. (S/25307).

## ١-٢: دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی

لێرەدا پێویستە هەندێ لەو فاکتانە کە سۆنگەی دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی بوون، بهێنینەوە یاد. لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، ماوەیەکی درێژ، سەبارەت بە ستەم و پرکێشیی لێدانی دەوڵەتێك لەلایەن دەوڵەتێکی دی و ئەو رەوتارە توندو دڕندەو نامرۆیانەی دەرهەق بە خەڵکی سڤیل و سوپاییان وەکو یەك لە کاتی شەڕدا دەکران، شەریعەتی دارستان فەرمانڕەوا بووە. ئەم بیرە بنچینەییە بووە مایەی ئەوە لە ماوەی سەدەو نیوێکدا، بنەماگەلێك لە قانوونی نێودەوڵەتیدا بێنە گۆڕێ کە ئەو کاروکردانە رێکبخەن و پێشیان لێبگرن.

ئێمە دەزانین قانوونی نێودەوڵەتیی هاوچەرخ، نوێنەرەوەی دوا قۆناخە لە قۆناخەکانی پەرەسەندنی لەسەریەك کەڵەکەبووی بەردەوامدا کە لە دێرزەمانەوە دەستی پێکردووە[٤٧]، لە سەرینی ئەمەوە، بوونی رێککەوتننامەگەلێکی نێودەوڵەتی لە بواری بەهای ئاکارەکی و مافەکانی مرۆڤدا، پێویستییەك بوون کە شەریعەتی ئاسمانی و نەریت و ئادابی نێودەوڵەتیی و ویژدانی مرۆڤایەتی دەیخواستن. ئەو رێککەوتننامانە داوای جێبەجێکردنی بەهای ئاکارەکی دەکەن کە خۆیان لە رێزگرتن لە مرۆڤ و مافی ژیان و رێزگرتن لە قانوون و سزادانی دەستدرێژکار بە توندترین سزای تاوانکاریی، دەبیننەوە،.

---

[٤٧] سروشتی قانوونی نێودەوڵەتی، باکگراوەندی مێژووییی خۆی راڤە دەکات کە لە رووی دیرۆك و کاتەوە زۆر لە مێژینەترە کە "بۆیەی ئەورووپایی مەسیحیایەتی" کە بۆ ماوەی سێ سەدەو زیاتریش باوبووە، لێ بدرێ، بەر لەوەی ببێ بە قانوونێك کە کۆمەڵەیەکی گەورەتری دەوڵەتان بگرێتەوە. بەم شێوەیەو لە سەرینی پەرەسەندن و هەراو بوونی ئاقاری کۆمەڵەی نێودەوڵەتییەوە بۆیە ئەوروپاییەکەی لێ بووەوە. مێژووی قانوونی نێودەوڵەتی و کۆنترین دۆکیومێنتی دیرۆکی، بۆمان ساغ دەکەنەوە کە گەلان و دەوڵەتان لە سەردەمی رێنسانس و سەردەمی دۆزینەوەی جوگرافی و سەرهەڵدانی ئیسلام و سەردەمەکانی یۆنان و رۆمەوە تا دەگاتە سەردەمی میسری و بابلییەکانی کۆنی کۆن، کۆمەڵێ قانوون و نەریتیان لەمەڕ هاوپێوەندیی نێوان خۆیاندا هەبووە.

بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ:

1- Arlhaur Nussboum, A concise History of the Law of Nations, N.Y , 1947

2- Q/ wright, Asian Experience and International Law, International Studies Quarterly, Vol. I, 1959, pp. 71-87.

وەلێ بێ مفا نییە، ئەگەر لێرەدا باس لە بن و بۆتکەی قانوونی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی بە چەمکە نوێیەکەی پێش سەدەی نۆزدەم بکرێ کە تیایدا بەرە-بەرە بناغە هەوەڵێنەکانی ئەم قانوونە روون دەبووەوە.

### ١-٢-١: پێشینەی نێودەوڵەتیانەی سزادانی تاوانگەلی نێودەوڵەتی

چەندین پێشینەی مێژووییەوە هەوڵوکۆششی نرت و نوێ بۆ دامەزراندنی دادگەگەلی نێودەوڵەتی سەبارەت بە دادگاییکردنی تاوانبارانی شەڕ، بەتایبەتی دوای شەڕی دووەمی جیهان، لە ئارادا هەبووە، کە بەسەریەکەوە زەوینەو هەلومەرجیان بۆ دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران سازکرد، جا ئەو هەوڵوکۆششانە لە چوارچێوەی UNدا بووبن، یان لە چوارچێوەی ئەقلیمیدا. ئەگەر بگەڕێینەوە دواوە یەکەمین کۆدو یەکەمین دەوڵەتێك کە گرنگی بەم کارە دابێ، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە لە کاتی شەڕی ئەهلیدا Civil War . لە مادده ٤٧ی ئەو ڕێنوێنیانەی Instructions کە لە ساڵی ١٨٦٣ دا بۆ سوپای ئەمریکا دەرچوون، هاتووە:

(ئەو تاوانانەی کە قانوونگەلی تاوانکاریی بە دەق باس لە سزادانیان دەکا، وەکو ئاگرتێبەردان، کوشتن، شێواندن، سەقەتکردن، لێدان، بریندارکردن، ساختەکردن، ژن ڕفاندن کە سەربازێکی ئەمریکایی لە خاکی دژمنەکەیدا دەرهەق بە دانیشتوانی ئەم خاکە ئەنجامی بدا، هەمان سزای بەسەردا ناسەپێندرێ کە ئەنجامدەرانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕووبەڕوویان دەبنەوە، بەڵکە لەو حاڵەتانەی کە سزای لەسێدارەدان نایانگرێتەوە، ئەوانە ڕووبەڕووی توندترین سزا کە لەم دەقەدا هاتووە، دەبنەوە).
کەچی مادده ٧١ دەڵێ:

(هەر یەکێ بە ئانقەست دژمنێکی تەواو پەککەوتە، بریندار بکا، یان بکوژێ، یان فەرمانی کوشتنی بدا، یان هانی سەربازان بدا بیکوژن، ئەگەر تاوانەکەی لەسەر ساغ

بۆوە ئەوا سزای لە سێدارەدانی بەسەردا دەدرێ جا ئەو کەسە ئەندامی سوپای ئـەمریکا بێ، یان دژمنێك بووبێ و دوای ئەنجامدانی تاوانەکە بەدیل گیرابێ)[٤٨].

### ١-٢-١-١: پێشینەی مێژووییە

پاش ئەوەی لە ١٩١٨/١١/١١دا ئەلمانیای دۆڕاوو هاوپەیمانان ئاگربەسیان مۆرکرد، لیژنەیەکی پازدە ئەندامی لە هاوپەیمانان بۆ لێکۆڵینەوە لە بەرپرسیارەتیی تاوانبارانی شەڕ، پێکهات. ئەم لیژنەیە لە راپۆرتی ١٩١٩/٣/٢٥دا، تاوانبارانی شەڕی کردووە بە دوو دەستەوە:

**دەستەی یەکەم:**

لە بەردەم دادگەی ئەو دەوڵەتەی کە زیانی پێکەوتووە دادگایی دەکرێن. تاوانـەکانیش بریتین لە: پێشێلکردنی قانوون و نەریتەکانی شەڕ وەکو: کوشتنی بەبارمتەگیراوان، بەزۆر بەشدارییپێکردنی دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکان لە ئیش و کاری جەنگیدا.

**دەستەی دووەم:**

ئەو تاوانبارانەی شەڕ دەگرێتەوە کە بە کردەوە زیانیان لە چەند دەوڵەتێك داوە. لەوانە: خراپ رەوتارکردن لە گەڵ دیلەکانی شەڕدا کە سەر بە چەند دەوڵەتێك بووبن و لە یەك کامپدا کۆ کرابنەوە، هەروا ئەو تاوانانەی هەر بە سروشت لە بەردەم دادگەگەلی نێودەوڵەتیدا دادگایی دەکرێن، ئا ئەوانە لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا دادگایی دەکرێن.

---

[٤٨] د. عبد الرحیم صدقي، القانون الدولي الجنائي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١-١٢، لێرەدا دەبینین دەقی یەکەم (مادده ٤٧) سزای سەربازانی ئەمریکایی دەدا، کەچی مادده ٧١، هەم ئەمریکایی و هـەم دژمنـان دەگرێتـەوە. لێـرەدا رێنوێنییـەکان ئاماژە بۆ ئەو سەربازە ئەمریکاییانە دەکەن کە لایەنگری بەرەی باشوور بـوون لـە شـەڕی سـەربەخۆییدا، هـەروا ئەگـەری سەربازی دیش هەیە کە هی ویلایەتە یەکگرتووەکانی باکوور نەبووبن.

لە پەیماننامەی سیڤەردا کە لە ١٩١٩/٦/٢٦دا مۆرکرا، دەقێکی سەبارەت بە دامەزراندنی دادگەگەلی نێودەوڵەتی بۆ ئەو تاوانانە تێدابوو کە درابوونە پاڵ بەرپرسیارانی تاوانەکانی شەڕەوە[٤٩].

هەروا لە قۆناخی نێوان هەردوو شەڕی جیهانیدا، چەند پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتی مۆرکراون، بێگومان شەڕی یەکەمی جیهان کارتێکردنێکی راستەوخۆی بەسەر پەرەسەندنی قانوونی نێودەوڵەتییەوە هەبوو، لە نێو ئەم پەیماننامانەدا:

- هەردوو رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٢٩جنێف کە لە ١٩٢٩/٧/٢٧دا مۆرکراون. رێککەوتننامەی یەکەمیان لەبارەی چاترکردنی حاڵ و باری بریندااران و نەساغەکانی شەڕگە و دووەمیان لەبارەی دیلەکانی شەڕەوەیە.

[٤٩] B. Roling, Crimes against peace, Encyclopedia of Public International Law, North Holland Pubishing Company, Amesterdam, Vol. 1, 1992, p. 872.
پەیماننامەی فرسای بە دەق باسی لە دادگاییکردنی ئیمپراتۆری ئەلمانیا، غلیۆمی دووەم کردووە، چونکە شەڕی لە دژی ئەورووپا هەڵایساندبوو، هەروا لە ماددەکانی ٢٢٧-٢٢٩ باس لە دادگاییکردنی ئەوانەی لە تاوانەکانی شەڕ بەرپرسیار بوون کراوە، ماددە ٢٢٧ی پەیماننامەکە دیاریکردووە کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان تۆمەت ئاراستەی غلیۆمی دووەم دەکەن و دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تایبەت بۆ دادگاییکردنی ئەو دادەمەزرێ کە مافە بنەڕەتییەکانی دیفاعی تێدا دەستەبەر دەکرێ و دادگەکە لە (٥) دادوەر کە دەوڵەتەکانی: ئەمریکا، بەریتانییای مەزن، ئیتالیا، فەرەنسا، ژاپۆن دایان دەنێن، پێکدێ و ئەم دەوڵەتانە داوانامەیەك دەدەنە هۆلەندا کە ئیمپراتۆری راکردوویان تەحویل بداتەوە, ماددەکانی ٢٢٨- ٢٣٠ باس لە حەواڵەکردنی ئەو کەسانە دەکا کە گوناهبارکراون بە ئەنجامدانی کاروکردەی دژ بە قانوونەکانی شەڕ، هەروا حەواڵەکردنی فەرماندەکانیشیان بۆ بەردەم دادگەگەلی سەربازی ئەلمانی، یان دادگاکانی سەر بە هاوپەیمانان. ئەم ماددانە ئەلمانیا پابەند دەکەن بە تەحویلدانەوەی تاوانباران بە دەوڵەتانی هاوپەیمان و بەشدار و درانیان بە دادگەگەلی سەربازی ئەلمانی، یان دادگەگەلی هاوپەیمانان. حکوومەتی ئەلمانیا بەڵێن دەدا هەموو دۆکیومێنت و زانیارییەك، جا هەر جۆرێك بن، پێشکێش بکا و وەدوای تاوانباران بکەوێ و بەرپرسیاریەتییەکان بە شێوەیەکی راست و دروست هەڵبسەنگێنێت، وەلێ غلیۆمی دووەم رایکردبووە هۆلەنداو دادگاییی نەکرا، چونکە هۆلەندا رازی نەبوو تەحویلی بداتەوە ولە ساڵی ١٩٤٠دا بە مردنی خۆی مرد. هەرچی سەرکردەکانی دی ئەلمان و ئەوانی دی کە تاوانی شەڕیان ئەنجام دا بوولە شاری لایبزیگ Liepizg دادگایان بۆ داندراو ئەم دادگایە تەنیا سێ کەسیانی لێ حوکم دان. فەرەنساو بەریتانیاش ئەو سەربازە ئەلمانیانەی لە لای خۆیان دیل بوون و تاوانی شەڕیان ئەنجام دابوو، دادگاییکرد و حکوومەتی ئەلمانیا رازی بوو کە ٦ ئەفسەریان تەحویل بداتەوە، وەلێ پاشان پەشیمان بۆوە و رازی نەبوو تەحویلیان بداتەوە. ئیدی ئەوە دێتە بەر زەین کە ئەم دادگاییانەی ئەلمانیا، لە دادگاییی شکڵی بەو لاوە، شتێکی دی نەبوون.

- پەیماننامەی ١٩٣٧ ی تایبەت بە سزادانی نێودەوڵەتییانەی تیرۆرە. ئەم پەیماننامەیە لە ئاکامی تیرۆرکردنی مەلیکی یۆگۆسلافیا و وەزیری دەرەوەی فەرەنساوە هاتە ئارا و پرۆتۆکۆلێکی سەبارەت بە دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی بۆ دادگاییکردنی ئەو تاوانە پێوە لکێنرابوو. لێ ئەم رێککەوتننامەیە بە مردوویی هاتە بوون، چونکە یەك تاکە دەوڵەت کە ئەویش هیند بوو، پەسندی کرد[٥٠].

دوای بیست ساڵ بەسەر تێپەڕبوونی شەڕی یەکەمدا، شەڕی دووەمی جیهان هەڵایسا کە ئێش و ئازارێکی زۆری ئەورووپاو سەرلەبەری مرۆڤایەتی دا و قەسابخانەو کاری نارەوای ئەوتۆی تێدا ئەنجامدرا کە پێشتر مرۆڤایەتی شتی وای بە خۆوە نەبینیبوو، ئەو شەڕە نزیکەی شەش ساڵ دەوامی کێشا. هەر کە شەڕی دووەمی جیهان بە کۆتا هات، کاتی جێبەجێکردنی دادپەروەری هاتە پێشەوەو بەرپرسیاران کەوتنە پرسیاری ئەوەی کە دەبێ چ جۆرە دادپەروەرییەك دەرهەق بە تاوانبارانی شەڕ جێبەجێ بکرێ. لە ١٩٤٥/٨/٨دا، رێککەوتننامەی لەندەن دەرچوو، کە باس لە پێکهێنانی دادگەیەکی میلیتاریی نێودەوڵەتی بۆ دادگاییکردنی گەورە تاوانبارانی شەڕ دەکا. ئەم رێکەوتنە بە دادگەی نۆرمبێرگ ناسراوە و پاشان لە ١٩٤٥/١٢/٢٠دا، قانوونی ژمارە ١٠ بۆ دادگاییکردنی تاوانبارانی دی دەرچوو.

ئەو دادگاییانەی کە ئەم دادگایانە ئەنجامیان دا،باسیانلێکراوەو پێویست بەوە ناکا لە وردو درشتیان وەکۆڵین. وەلێ گرنگترین رووی ئەو کەم وکەسری و رەخنانەی لە دادگاییکردنەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆ و دادگە نیشتمانییەکاندا هەبووەو گیراوە، دەخەینە بەرچاو تا بزانین داخوا چۆن دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران بە هۆی ئەو دەزگاو رێوشوێنانەی پێکیهێناون، هەوڵی داوە ئەو کەم و کێماسییانە چارەسەر بکا، دیارترین ئەو رەخنانە ئەمانەن:

---

[٥٠] د. محمد محيى الدين عوض، ( جرائم الصرب والكروات ضد شعب البوسن والهرسك تكييفها والمحاكمة عنها دوليا)، المجلة العربية للدراسات الامنية، المجلد الثامن، العدد ١٦، الرياض، ١٩٩٣- هامش رقم ٢١ ص ٣٥.

- پێشێلکردنی ڕێساگەلێکی قانوونی لە لایەن ئەم دادگایانــەوە، وەکـو ڕێزگـرتن لــە قانوونیبوونی تاوان و سزاکان و بەرەو دواوە کارنەکردنی قانوونگەلی تاوانگەری.
- گوێنەدان بە دانانی دادوەری بێلایان لە دادگەدا.
- لێنەکۆڵینەوەی دادگە لەو تاوانانەی کە هێزەکانی دەوڵەتە سـەرکەوتووەکانی شـەڕ ئەنجامیان دابوون.
- جیاوازی و ناتەبایی دادڕەوییە قانوونییەکان.
- دامەزرانـــدنی دادگەکـــە لـــە لایـــان دەوڵەتـــە ســـەرکەوتووەکانی شـــەڕەوە و دادپەروەرییەکەشـیان، دادپــەروەریی ســەرکەوتوو بــوو دوای بردنــەوەی شــەڕ و تێکشکاندنی دژمن.

### ١-٢-١-٢: هەوڵوکۆششی تـازە بـۆ دادگـاییکردنی تۆمـەتپێکراوان بـە تاوانگـەلی نێودەوڵەتی

دیارترین هەوڵوتەقەلایەك لە چوارچێوەی UN دا بۆ پێکهێنانی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی ئەوە بووە کە کۆمەڵەی گشـتیی UN لـە سـاڵی ١٩٥٠دا، لیژنەیـەکی ١٧ ئەندامی بۆ داڕشتنی گەلاڵەنامـەی دادگەیـەکی نێودەوڵـەتیی تاوانگـەریی راسـپارد و پاشان کۆمەڵەی گشتی، لیژنەیەکی تازەی راسپارد کە ئەم ئەرکە بەجێ بگەیەنێ بەهۆی ئـەو خۆگرییانـەی Reservations لەسـەر کارەکـانی لیژنـەی یەکـەم هـەبوون، کەچـی گەلاڵەنامەی لیژنە تازەکەش ڕەزامەندیی هەر لەسەر نەدرا[٥١].

[٥١] بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی داڕشتنی پرۆژەی ڕێککەوتننامەی دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاری، بڕوانە: د. محمد محيي الدين عوض، دراسات في القانون الدولي الجنائي، دار الفكر العربي، ١٩٦٦، ص ٨٠-٩٣، و عن اعمال لجنة جنيف لسنة ١٩٥١ واعمال لجنة نيويورك ١٩٥٣، ص ٩٤-١٢٢.

ساڵی **١٩٥٧**، کۆمەڵەی گشتی بڕیاری دا کە پێکهێنانی دادگەکە دوابخات تا لەسەر پێناسەی دەستدرێژی- Aggression ڕێککەوتن دەبێ[٥٢]. پاش ئەوەی کە ساڵی **١٩٧٤**، پێناسەیەك بۆ دەستدرێژی داندرا[٥٣]، ئەمجارە کۆمەڵەی گشتی، لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتیی سەر بە کۆمەڵەی گشتی ڕاسپارد کە بۆ ئامادەکردنی گەلاڵەنامەی **کۆدی تاوانگەلی دژ بە ئاشتی و تەنایی مرۆڤایەتی**، دەست بە کارەکانی خۆی بکاتەوە تا لە بەر ڕۆشنایی لە پێشتربوون و بۆ بژارو تەتەڵەکردنی پرۆژەکە بە لەبەرچاوگرتنی پەرەئەستاندنی بەرە بەرەی قانوونی نێودەوڵەتی لە گەلاڵەنامەکە بکۆڵێتەوە. لەو ساوە تا ساڵی **١٩٨٩** کۆمەڵەی گشتی چیدیکە خۆی نەهێنایەوە سەر باری بابەتی دادگەی نێودەوڵەتی ، ئەو ساڵە سەرلەنوێ داوای کردەوە لە دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی بکۆڵدرێتەوەو دووبارە لە ساڵی **١٩٩٢**دا داوای لە لیژنەی قانوونی کردەوە کە پرۆژەی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی بخاتە بەر لێکۆڵینەوەوە، بە هەرحاڵ، بابەتی دامەزرانی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران و هەوڵوتەقەلاکانی لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتی هەر یەکەیان بەجیا، جێگەو ڕێگەی خۆی هەیە[٥٤].

---

[٥٢] بڕیاری ١١٨٧ (XII)ی کۆمەڵەی گشتی لە ١٩٥٧/١٢/١١.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ١٢، ١٩٥٧.

[٥٣] بڕیاری ٣٣١٤ (XXIX)ی کۆمەڵەی گشتی لە ١٩٧٤/١٢/١٤.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٢٩، ١٩٧٤.

[٥٤] Jean- pierre Puissachet, Vers un Tribunal Penal International, Les Deffcultes, Droit et De'mocratie, La Cocumentation Francaise, 1995, p. 43.
Alain Pellet, Le Tribunal Criminal International Pour Lex Yougoslavie, R.G.D.I.P, Tome 98, 1994, p.10.

شایانی گوتنـه، هـیچ ناتەباییـەك لـەو بـارەوە لـە گۆڕێـدا نییـە کـە ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی، سزاگەلێکی تاوانگـەریی دیاریکراویـان بۆ هەر کەسێك کە کارێکی پێشێلکاریی دەرهەق بە پابەندبوونـەکان ئـەنجام بـدا، تێـدا نییە. هەر چەندە لە ڕاستیدا دوو ڕێککەوتننامە هەن کە بۆ حەلوفەسلکردنی تاوانگەلی نێودەوڵەتی بە ڕاشـکاوانە دەسـەڵاتی دادوەری، وەلێ ئارەزوومەندانـە، بـە دادگەیـەکی نێودەوڵەتی دەدەن، ئەمانیش ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردنی جینۆسـاید (مـاددە ٦) و ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی سەرکوتانەوەو سزادانی لێککردنەوەی ڕەگەزییـە (مـاددە ٥)[٥٥].

هەرچی سەبارەت بە هەوڵ وتەقەڵای هەرێمایەتیی تایبـەت بـە پێکهێنـانی دادگەگـەلی نێودەوڵـەتیی تاوانگەرییـە، ئـەوا دەوڵـەتانی ئـەمریکایی و ئـەوروپایی گرنگییـەکی تایبەتییان بە دامـەزرانـدنی دادگەیـەکی نێودەوڵـەتیی تاوانگـەریی بـۆ دادگـاییکردنی تاوانبارانی شەڕ داوە. لیژنەی قانوونیی سەر بە ڕێکخـراوی دەوڵـەتانی ئـەمریکایی بـۆ لێوەکۆڵینی ڕاپۆرتێك لەمەڕ ئەم بابەتە، لە ئابی **١٩٩٢** کۆبۆوە و یەکێتیی ئـەوروپاش سەبارەت بە دامەزراندنی ئاوا دادگەیەك لە پێشنیارێکی کۆڵیبۆوە[٥٦].

---

[٥٥] دەقی ماددە ٦ی ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردنی جینۆساید دەڵێ:

"هەر کەسێکی تۆمەتپێکراو بە ئەنجامدانی جینۆساید، یان هەر کارو کردەیەکی تر کە لە ماددە **٣**دا ناویان هاتووە (جینۆساید و پلانگێڕان و دنەدان و هەوڵی ئەنجامدان و بەشداریکردن تیایدا) لە بەردەم دادگەیەکی تایبەتکاریی دادگەکانی ئەو دەوڵەتەی کاروکردەکە لە سەر خاکی ئەودا ئەنجامدراوە، دادگایی دەکرێ، یان لەبەردەم دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی خودان دەستدان لە ڕاست ئەو لایەنە ڕێککەوتووانەی کە ددانیان بە دەستدانەکەی ناوە".

لە کاتێکدا ماددە **٥**ی ڕێککەوتننامەی سەرکوتانەوەی جیاکاریی نەژادی دەڵێ:

" دەشێ ئەو کەسانەی بە ئەنجامدانی کارێك لەو کارانەی کە بەناو ناویان لە ماددە **٢**ی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا هاتووە لە بەردەم دادگەیەکی تایبەتکاری دادگەکانی دەوڵەتی تەرەفدارەوە کە لەوانەیە دەسەڵاتی بەسەر ئەو تۆمەتبارکراوانەدا بڕوا، دادگایی بکرێ، یان لەبەردەم دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریەوە کە دەستدانی دادوەریی سەبارەت دەوڵەتانی ئەندام هەبێ، ئەم دەسەلاتەیان پەسندکردووە".

[٥٦] تێبینی ئەوە دەکرێ کە دەوڵەتانی ئەوروپایی چ بە کۆو چ تاك تاکە دەورێکـی دیاریـان لـە دامەزرانـدنی دادگەیـەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران هەبووە:

هەروا چەند کەسێك یارمەتیی زیندووڕاگرتنی کەلەپووری نۆرمبێرگ و تۆکیۆیان داوە و مژدەی دادگاییکردنی پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆییان بە گوێی جیهان داداوە، رافایل لیمکین یەکێك بووە لەو کەسانەو بۆ خۆی ، لە تەك ژمارەیەکی کەم لە ئەکادیمییان[٥٧] لایەنگری رێککەوتننامەی قەدەخەکردنی جینۆساید بووە.

---

- گەڵاڵنامەی کۆنگرەی تەنایی و هاریکاری لە ئەورووپا (C.S.C.E ) کە ئەنجوومەنی کۆنگرە لە ١٩٩٣/٢/١٩دا پەسندی کردووە کۆنگرە لە کۆمبوونی خۆیدا لە ١٩٩٢/١٢/١٥دا لە ستۆکهۆڵم (سوید) رازیبوو بە ئامادەکردنی پرۆژەی رێککەوتننامەیەك لەبارەی دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت و راسپێردراو بە دادگاییکردنی تاوانەکانی شەڕو تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی کە لە یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون، سەرچاوەی پێشوو.
- گەڵاڵەنامەی ئیتالیا، لە ١٩٩٣/١/٢٤دا ، لیژنەیەك بە سەرۆکایەتی وەزیری دادی ئیتالیا- جۆڤانی کۆنسۆ، پێکهێندرا بۆ دامەزراندنی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تایبەت، سەرچاوەی پێشوو.
- گەڵاڵەنامەی فەرەنسا، وەزیری دەرەوەی پێشووی فەرەنسا، رۆلان دۆما لە ١٩٩٢/١/١٥دا، لیژنەیەکی بۆ راوێژکردن پێکهێنا لەبارەی دامەزرانی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە دادگاییکردنی تاوانەکانی شەڕو تاوانەکانی دەرهەق بە مرۆڤایەتی، یان پێشێلکارییە زل و زەقەکانی هەندێ لە رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان کە لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون، لیژنەکە لە ١٩٩٣/٢/٨دا پرۆژەی خۆی پێشکێش کرد، سەرچاوەی پێشوو.
- سکرتێری گشتیی UN بۆ ئامادەکردنی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران، بەشێوەیەکی بەرچاو، پشتی بەم پرۆژانە بەست.

بگەڕێوە بۆ:

M. Cherif Bassiouni, Project de Statut du Tribunal Penal International, Interoduction, Association International de droit penal, ce’r’es, 11993, p.145.

[٥٧] گرنگترینەکەیان د. محمود شەریف بەسیۆنی بوو کە پرۆژەی دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی (هەمیشەیی)، یان (تایبەت )ی پێشکێش کرد بۆ پێشەبڕکەگرتن لە دواکەوتنی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیی لە دامەزراندنی دادگەیەکی لەم بابەتە. سەرچاوەی پێشوو، ل١٦١.

هەروا بگەڕێوە بۆ:

Theoder Meron, International Criminalization of Internal Atrocities, AJIL, Vol. 89, 1995, p.554.

### ١-٢-٢: هۆیە ڕاستەوخۆیەکانی دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی

کۆماری یۆگۆسلافیای جاران (کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی سۆسیالیستی) لە چەند میللەت و نەتەوەو ئایینی جیا-جیا: سیرب و کروات و بۆسنی و هی تر پێکهاتبوو. هەروا دەوڵەتی یۆگۆسلافیا لە چەند کۆمارێك پێکهاتبوو: کرواتیا (پایتەختەکەی زگرب بوو)، مەقدۆنیا ( پایتەختەکەی سکۆبی بوو)، بۆسنیا و هەرسك ( پایتەختەکەی سەرایڤۆ بوو)، سلۆڤینیا (پایتەختەکەی لیوبلیانا بوو) و مۆنتینگرۆ (واتە کێوە ڕەش پایتەختەکەی تیتۆ گراد بوو) و سربیا (پایتەختەکەی بولگراد بوو)، سەرباری ئەوانەش دوو هەرێمی خودموختاری کۆسوڤۆ و فودیفۆیناش هەبوون[٥٨]. کۆماری یۆگۆسلافیای جاران ئەندام بووە لە چەند ڕێککەوتننامەیەکدا کە پێوەندییان بەم بابەتی لێکۆڵینەوەیە هەیە لەوانە: پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان (ساڵی ١٩٤٥) ، ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردن و سزادانی جینۆساید (ساڵی ١٩٤٨)، ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و هەردوو پرۆتۆکۆلی سەرباری ١٩٧٧ ، بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکانی ساڵی ١٩٦٦ ، ڕێککەوتننامەی بەرەنگاربوونەوەی ئەشکەنجەدان و چەشنەکانی تری بەدڕەوتاری ساڵی ١٩٨٤ و دیماهی ڕێککەوتننامەی پاراستنی مافەکانی منداڵ (ساڵی ١٩٨٩)[٥٩].

---

[٥٨] بە پێی دەستووری یۆگۆسلافیای جاران کە لە ١٩٧٤/٢/٢١دا دەرچووە، یۆگۆسلافیای جاران ، بۆ شەش کۆمارو دوو هەرێمی خودموختار دابەش بووبوو.

[٥٩] ئا ئاوا دەوڵەتی جێگرەوە، پابەندە بەو شتانەی کە دەوڵەتی بەر لـە خـۆی بـە پێـی بنـەماکانی قـانوونی نێودەوڵـەتیی خستبوونیە ئەستۆی خۆیەوە تا ئەو دەمەی لەو پەیماننامانە دەکشێتەوە بە پێـی ئـەو مەرجـانەی لـەو ڕێککەوتننامانـەدا هاتوون، سەرباری ئەوەی کە هەر یەك لە سربیا و مۆنتینیگرۆ، کرواتیا، سلۆڤینیا، بۆسنیاو هرسك، مەکدۆنیا، لە چەندین بۆنەدا هەر لە دەسپێکی ململانەکـەوە ڕایانگەیانـد بـوو کـە ئـەوان پابەنـدن بـە ڕێککەوتننامـەکانی جنێـف و هـەردوو پرۆتۆکۆلەکەیانەوە.

وەکو نموونە: مادده ١٤ی ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردنی جینۆساید دەڵێ: ماوەی ڕێککەوتننامەکە ١٠ ساڵە لەرۆژی کەوتنە بەرکارەوە و دوای ئەوەش ڕێککەوتننامەکە بۆ ماوەی ٥ ساڵی تر کە شیاوی نوێکردنەوەی بەردەوامە، پێڕەوی لێ دەکرێ، سەبارەت ئەو ئەندامە ڕێککەوتووانەی داوای لێکشانەوەیان نەکردووە، بەر لە شەش مانگ لە بەکۆتاهاتنی ماوەی ڕێککەوتننامەکەو خۆکێشانەوەش بە شێوەی نووسین دەبێ کە سکرتێری گشتی لێ ئاگادار دەکرێتەوە .

لەسەر ئەم هیم و بناغەیە، هێنانەوە گـۆڕێی هەنـدێ فاكـت بـە پێویسـتییەكی گـرنگ دەزاندرێ بۆ حاڵیبوون لە هۆیــە راسـتەوخۆیەكانی دامەزرانـدنی دادگـەی نێودەوڵـەتی. یۆگۆسلافیا لە دوای شەڕی یەكەمی جیهانەوە بە ناوی شانشینی سربیا لەسەر نەخشـەی سیاسیی ئەورووپا دەركەوت و لە كاتی شەڕی دووەمی جیهاندا، ئەلمان و ئیتالیاییـەكان داگیریان كردو دوای تێكشكانی ئەلمانیاش، یۆگۆسلافیا لە ژێر رێبەرایەتی جۆزیف تیتـۆ دا سەربەخۆیی خۆی وەرگرتەوەو— پـاش ماوەیـەك بشـێوی و گـرژی - لـە كۆمـارێكی فیدرالیدا یەكیگرتەوە. دوای مردنی تیتـۆ لـە ٤ی ئایـاری ١٩٨٠دا، بنیـادی رفـۆك و لەرزۆكی یۆگۆسلافیای جاران دووچاری لەبەر یەكهەڵوەشان و دواتر دارمـان بـووەوە، لـە ساڵی ١٩٨١ را شیرازەی ئاسایش تێكچوو، بووە هەڵلا و بگر، لە پێناو سەربەخۆییدا نا ئارامی و بشێوی دەستی پێكردو دوای رووخانی كامپی رۆژهەلاَت لـە سـاڵی ١٩٩٠دا، حكوومەتە خۆجێیەكانی یۆگۆسلافیا، یەك بە دوای یەكـدا، سـەربەخۆبوون. هـەر لـەم ساڵەدا، بۆ یەكەمین جار هەڵبژاردنێكی دیموكراتی لە یۆگۆسلافیای جـاران سـازكراو لـە ئاكامـدا حزبـە نەتەوەییـەكانی هـەر كۆمارێـك، واتـە حزبـی نەتـەوەی باڵادەسـت، بردیانـەوە[٦٠]. ئینجـا ئـەو كۆمارانـەی یـەكێتیی یۆگۆسـلافیای جارانیـان پێكـدەهێنا،

---

بڕگەی أ ی مادده ٣١ی رێككەوتننامەی دژایەتیكردنی ئەشكەنجەدان (١٩٨٤)یش دەڵێ:

"هەر دەوڵەتێكی لایەن دەكارێ پێوەندیی خۆی بەم رێككەوتننامەیە بە كۆتا بێنێ بە هۆی ئاگاداركردنەوەیەكی نووسراوەوە كە بۆ سكرتێری گشتیی UN ی بنێرێ و بە كۆتاهاتنەكەش دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر مێژووی وەرگرتنی ئاگادارنامەكە لە لایەن سكرتێری گشتییەوە، كاری پێ دەكرێ."

ئەم كۆتاپێهێنانە، ئەم دەوڵەتە لە پابەندبوونەكانی بەرهەڵدا ناكا بە پێی ئەم رێككەوتننامەیە سەبارەت بە هەر كارو كردەیەكی بەر لەم خۆكێشانەوەیە ئەنجامدرابێ (بڕگە ب، مادده٣١).

هەروا سەیری مەوادەكانی ٦٢ و ٦٣ و ١٤٢ و ١٥٨ بەرو دوای هەر چوار رێككەوتننامەكانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و مادده ٥٢ ی رێككەوتننامەی ساڵی ١٩٨٩ ی مافەكانی منداڵ بكە.

بگەڕێوە بۆ:

د. محمد محيي الدين عوض، جرائم الصرب في المجلة العربية للدراسات الامنية، المصدر السابق، هامش ١٠-١٤، ص ٣٣-٣٤.

[٦٠] I.C.T.Y, Separate Opinion of Judge Sidhaw on the Defence Motion for Interloculory appeal on Jurisdiction, 20co, 1995, pp. 23-24.

سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند: هەر یەك لە کرواتیا و سلۆڤینیا و مەقدۆنیا و بۆسنیا و هەرسك لە یەکێتییە داڕووخاوەکە جیابوونەوەو سەربەخۆبوون، تەنیا سربیا و مۆنتینگرۆ (کێوە ڕەش) لە ناو یەکێتییەکەدا مانەوە و ئەمەش پێچەوانەی خەونی سیربەکان کەوتەوە کە پێشەواکانی سیرب بۆ پێکهێنانی سربیای گەورە دەیانەویست کۆمارەکانی یۆگۆسلافیای داڕماو لە ژێر کۆنترۆڵی سیربان یەکبخەنەوە. ئەم ئامانجەی سیربان، ڕووبەڕووی دانپێدانانی دەوڵەتانی جیهان بە سەربەخۆیی کرواتیا و سلۆڤینیا بۆوە، دوای ئەوەی ئەم دوو کۆمارە ماوەیەك شەڕو کوشتارێکی توندو تاڵیان لە دژی سیربەکان بەرپاکرد[61]، موسڵمانانی بۆسنیاو هەرسك لە بەردەم دووڕیانێکدا خۆیان دیتەوە: یان ئەوەتا لە ڕێگەی سازدانی ریفراندۆمێکی میللییەوە سەربەخۆیی خۆیان وەردەگرن، یان

I.C.T.Y, Prosecution Response to the Defences Brief Case, No: IT-94-1-T, 1 Sep. 1995, pp. 5-6.

[61] لە ١٩٩١/٦/٢٥دا هەر یەك لە سلۆڤینیاو کرواتیا، سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاندو لە ئاکامدا، ململانەیەکی چەکدارانەی توند لە نێوان هێزەکانی یۆگۆسلافیای فیدرالی کە لە ژێر کۆنترۆلی سیرب دابوون لە لایەکەوە و هێزەکانی سلۆڤینیا و کرواتیا لە لایەکی ترەوە، بەرپا بوو. لەسەر داوای یەکێتیی ئەورووپی، کرواتیاو سلۆڤینیا بۆ ماوەی سێ مانگان سەربەخۆیی خۆیان ڕاگرت.

لە کاتێکدا سلۆڤیناو کرواتیا حەزو بڕیاری سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند، پەرلەمانی فیدرالی (بندەستی سیربان) بڕیارێکی دا کە تیایدا داوا لە سوپا دەکا سنوورەکانی دەرەوەو ناوەوەی یۆگۆسلافیا بپارێزن.

- لە ١٩٩١/٩/٨دا، کۆماری مەقدۆنیا لە ڕێگەی راپرسییەکی گشتییەوە سەربەخۆیی خۆی راگەیاندو ئیدی لە پەراوێزی ململانەی یەکەمدا، ململانەیەکی تازە لە نێوان ئەم کۆمارەو یۆناندا سەبارەت بە ئاڵاو ناوی ئەم کۆمارە ڕوویدا کە یۆنان بە بەشێ لە کولتووری دیرۆکی خۆی دادەنێت.

- لە تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا، دەق لە ١٩٩١/١٠/٨دا، شەڕ لە نێوان هێزەکانی کرواتیاو هێزەکانی کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی هەڵایساو لە ناوەڕاستی تشرینی دووەمی ١٩٩١دا، دوای چەند مانگێك لە ئابلوقەدان، هێزەکانی فیدرالی شاری فوکوفواریان داگیرکرد.

- لە ١٩٩١/١١/٢٧دا، هەر یەك لە کۆماری سربیاو کرواتیاو لەشکری گەلی یۆگۆسلافیا لەسەر پابەندبوون بە بنەماکانی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و پرۆتۆکۆلی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ و بەتایبەتی پێشێلکارییە زل و زەقەکانی ڕێککەوتننامەی چوارەم، ڕێککەوتن.

- لە ١٩٩١/١٢/١٦دا، یەکێتیی ئەورووپی دانی بە سلۆڤینیا و کرواتیا دانا وەکو دوو دەوڵەتی سەربەخۆ لە ١٩٩١/١٢/١٥ەوە.

ئەوەتا لە بندەستی سیربەکان دەمێننەوە. ئـەوەبوو لـە ١٩٩٢/٢/٢٩دا ریفرانـدۆمێکی گشتییان ساز کرد، وەلێ سیربەکان بەشدارییان تێدا نەکرد. لـە ئاکامـدا لەسـەدا ٦٤ی گەل دەنگیان بۆ جیابوونەوەی بۆسنیاو هەرسك داو ئیدی لێرە بەدواوە کوشت و بـڕ دوای کوشتوبڕی خوێناوی دەستی پێکرد[٦٢].

لە ١٩٩٢/٤/٢٧دا مۆنتینگرۆ و سربیا دەوڵەتێکی سـەربەخۆیان بـە نـاوی (کۆمـاری یۆگۆسـلافیای فیـدرالی) راگەیانـد. ئـەم دەوڵەتـە هـەموو مـاف و پابەندبوونـەکانی یۆگۆسـلافیای جـارانی خسـتە ئەسـتۆی خـۆی و لـە ١٩٩٢/٥/٢٢دا، هـەر یـەك لـە کۆمارەکانی بۆسنیا و هەرسك، کرواتیاو سلۆڤینیا لە UN بە ئەندام وەرگیران[٦٣].

---

[٦٢] بە ماوەیەکی کەم دوای ریفراندەمی ١٩٩٢/٣/٦، بۆسنیاو هەرسك وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ خۆی راگەیاند و یەکێتیی ئەورووپی و ئەمریکاش لە ١٩٩٢/٤/٧دا ددانیان پێدانا، دەسبەجێ ململانەیەکی چەکدارانە لە نێوان هێزەکانی فیدرالی سەر بە سیربەکان و هێزە بچووکەکەی بۆسنیاو هەرسك دا دەستی پێکردو شەڕو بنار لە نێوان میلیشیاکانی سرب و میلیشیاکانی موسڵماناندا بەرپابوو.

[٦٣] لە هەمان رۆژدا، سەرکۆماری بۆسنیاو هەرسك و سەرۆکی حزبی کاری دیموکراتی (بە نوێنەری موسڵمانەکانی بۆسنیا)و سەرۆکی حزبی دیموکراتیی کرواتیا (بە نوێنەریی کرواتەکانی بۆسنیا) لەسەر ئەوە رێککەوتن کە پابەندی بنەماکانی ماددەی سێی هاوبەش لە نێو رێککەوتننامەکانی جنێف بن کە لە ململانەی چەکدارانەی ناوەخۆدا دێتە جێبەجێبوون و باس لە رەوشی قوربانییەکانی ململانێیە چەکدارییە نێوخۆییەکان، بەبێ پێناسەکردنی ئەم ململانێیانە، دەکاو تەنیا بەوەندە بەس دەکا کە لە رستەی یەکەمدا هێما بۆ (ململانەی چەکدارانە کە سروشتێکی نێودەوڵەتیی نییە) بکا. بە رەچاوکردنی ئەم تایبەتمەندییە، بنەمەکانی شەڕی نێودەوڵەتی بەسەر ململانەی چەکدارانەی نێوخۆییدا جێبەجێ نابن، وەلێ لە هەموو بارێکدا، کۆمەڵە ماف و گەرەنتییەك هەن کە لانی کەمی رەوتارکردنی مرۆڤانە پێکدەهێنن. ئەم ماددەیە تا ئەو دەمە لە ئارادایە تا رێکەوتنێکی تایبەت لە نێوان لایەنەکاندا بۆ جێبەجێکردنی سەرلەبەری بنەماکانی ئەم رێککەوتننامەیە، مۆردەکرێ.

بگەڕێوە بۆ دەقی ماددەی سێی ناوبراوو راڤەکردنەکەی لە:

Jean Pictet & others, Commentary IV of Geneva Convention relative to the protection of civilian persons in the time of war, ICRC, Geneva, 1958, pp. 25-45.

لەم دەورکردنەوەیەدا، خویایە کە ململانەی چەکداری هەوەڵجار لە سلۆڤینیا، ئەوجا لە کرواتیا و پاشان لە بۆسنیا و هەرسك دەستیپێکرد[٦٤]. وەلێ شەڕو بنارو نەبەردی لە ریشەدەرکێشانی ئیتنی و ئایینیی موسڵمانەکانی بۆسنیا و هەرسك ، ترس و خۆف چاندن لەناو زارۆ و پیر و ژناندا، کوشت و کوشتارو سەربڕین و دەستدرێژیکرنە سەر نامووس .. کە دەرهەق بە موسڵمانەکانی بۆسنیا و هەرسك کران، پێشتر نموونەیان لە مێژوودا نەبووە. ئەم ململانەیە چەکدارییەی لە بۆسنیا و هەرسك بەرێوەچوو، گەورەترین قەیرانی پەنابەرانی دوای شەڕی دووەمی جیهان[٦٥] لێکەوتەوەو هێزە ئاشتیپارێزەکانی UN یش (UNPROFOR)[٦٦] بوونە پشت و پەنای کارو کردەوەی فریاکەوتنی مرۆیی. رەهەندی ترسناکانەی کوشت وکوشتاری دڕندانە لە سلۆڤینیاوە بۆ کرواتیا پەڕیەوە و

[٦٤] سەرۆکی بۆسنیا، عەلی عیزەت لە ١٩٩٢/٦/٢٢دا جاڕی دا کە کۆماری بۆسنیاو هەرسك لە باری شەڕێکی دەستدرێژکارانە دایە کە کۆماری سربیاو مۆنتینگرۆ و لەشکری گەلی یۆگۆسلافیاو ناوچەکانی ژێر کۆنترۆلی حزبی دیموکراتیی سربی (سربەکانی بۆسنیا) لە دژی ئەوان بەرپایان کردووەو نیشانی دا کە موسڵمانەکانی بۆسنیا و هەرسك دووچاری وێرانکاری و لەناوبردن دەبنەوە

I.C.T.Y, Separate Opinion of Judge Sidhaw, op. Cit., p.24.

[٦٥] لە سۆنگەی بەردەوامبوونی شەڕو شۆڕ لە بۆسنیاو هەرسك، ئەنجوومەنی ئاسایش لە ١٩٩١/١٢/١٥دا، بڕیاری ٧٢٤ی دا کە تیایدا باس لە ناردنی هێزی نێودەوڵەتی بۆ ئەم ناوچانە دەکا، ژمارەی ئەم هێزانە بە گوێرەی بڕیاری ٧٢٧ی ١٩٩٢/١/٨ و بڕیاری ٧٤٠ی ١٩٩٢/٢/٧ زیادبوو، ئەو هێزە بووە کۆمەڵەی یەکەمی هێزی ئاشتیپارێزی سەر بە UN کە بە فەرمی بە پێی بڕیاری ٧٢٣ ی ١٩٩٢/٢/٢١ دامەزراو بە هۆی بڕیاری ٧٥٨ی ١٩٩٢/٧/٨ و بڕیاری ٧٦٩ی ١٩٩٢/٨/٧ ئەرکەکانی نوێکرایەوە و ژمارەکەی زێدەکرا.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٦، ١٩٩١.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٧، ١٩٩٢.

[٦٦] کۆمیسیۆنی باڵای پەنابەران رایگەیاند کە ٣٥٠ هەزار کەس بێ جێو ڕێن لە کانوونی یەکەمی ١٩٩١، لە ئایاری ساڵی ١٩٩٢دا ئەم ژمارەیە بووە ملیۆن و نیوێك پەنابەر و پاشان لە تەمموزی ١٩٩٢دا گەیشتە دوو ملیۆن و سێ سەد هەزار پەنابەر، بە زێدەبوونی ژمارەکان، تاوانیش دەرهەق بە پەنابەران لە زیادی دا، پاش ئەوەی کە ٧٠٪ی خاکی بۆسنیاو هەرسك کەوتە بندەستی سیربەکانەوە.

بگەڕێوە بۆ خشتەی (٤) لە کۆتایی ئەم باسەدا، کە تیایدا ژمارەی پەنابەرانی بۆسنیاو هەرسك و دەوڵەتانی ئەورووپی روونکراوەتەوە.

دواتر بۆ بۆسنیا و هەرسك، ویـژدانی هـەموو نەتـەوەكانی بـە ئاگاهێنایـەوە. UNیـش لەمبارەوە پەیتا- پەیتا راپۆرتی لە كۆمیسیۆن و لیژنەكانی خۆی[٦٧] و لـە رێكخـراوە نـا حكومییەكان NGO پێدەگەیشت[٦٨].

### ١-٢-٣: لە پێشتربوونی دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی

بە گوێرەی مادده ٩ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی[٦٩]، بەرتری دراوە بە دادگەی نێودەوڵەتی بەسەر دادوەریی ناوەخۆی دەوڵەتانی یۆگۆسلافیای جاران بۆ دادگاییكردنی ئەوانەی بە تاوانگەلی لە گینە، تۆمەتباركراون لە چوارچێوەی دەستدانی دادگەدا. دادیاری داكۆكیش ئەم تێزەی بەم شێوەیەی خوارەوە لە كێشەی تادیشدا وروژاند:

(لەبەرئەوەی لە ئاكامی داخوازیی دەستەهەڵگرتن، كە دادگەی نێودەوڵەتی پێشكەش بە حكومەتی كۆماری ئەڵمانیای كردبوو، تۆمـەتپێكراو لـە بـەردەم دادگـەی نێودەوڵەتیـدا ئامادە بووە ، ئەوا دادگەی نێودەوڵەتی بە لەپێشتر بوونی لـە دادگەگـەلی نیشـتمانیدا،

---

[٦٧] لە نێو ئەم دەستەو لیژنانەدا:

نێردراوی تایبەتی لیژنەی مافەكانی مرۆڤ/UN، ئۆفیسی كۆمیسیۆنی باڵای پەنابەران، هێزە پارێزوانەكانی UN، لیژنەی كارناسانی UN.

[٦٨] لەنێو ئەم سازمانانەدا: سازمانی لێبوردنی نێودەوڵەتیی، لیژنەی نێودەوڵەتیی خاچی سوور، كۆمیسیۆنی نێودەوڵەتیی مافەكانی مرۆڤ.

[٦٩] ماددەی نۆی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی، بابەتی دەستدانی هاوبەش ڕووندەكاتەوە:

١- دادگەی نێودەوڵەتی دەستدانێكی هاوبەشی هەیە لەمەڕ دادگاییكردنی ئەو كەسانەی بەرپرسیارن لە پێشێلكارییە زل و زەقەكانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی كە لە ١٩٩١/١/١-ەوە لە یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون.

٢- دادگەی نێودەوڵەتی بەسەر دادگەگەلی نیشتمانیەوەی هەیە. دادگەی نێودەوڵەتی بۆی هەیە لە هەر قۆناخێك لە قۆناخەكانی دادخوازیدا، بە فەرمی لە دادگە نیشتمانییەكان بخوازێ واز لە دەستدانەكانیان بێنن، بەپێی ئەم پێڕەوی ئەساسییەو تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی‌و ڕێساگەلی سەلماندنی دادگەی نێودەوڵەتی".

وەکو شوێنەوارێکی راستەوخۆ، ئەم کـارە بـەردەوامی بـە پێشـێلکردنی سـەروەریی دەوڵـەتان دەدا)[٧٠].

ئەمەیان بنەمای دووەم بوو لەو تێهەڵچوونەوەیەی کە پێشکێش بە دادگـەی نێودەوڵـەتی کـرا، دادیـاری داکـۆکی نیشـانی دا کـە دایـرەی دادگـە دەبـێ ئـەو دەسـتدانەی لـە سـەرینی لـە پێشتربوونیەوە پراکتیزەی دەکات، رەتبکاتەوە، لە کاتێکدا تۆمەتپێکراو لە کۆمـاری ئـەلمانیا دادگایی دەکراو دادوەریی ئەلمانیاش لە باری دایە بە پێی قانوونی نێودەوڵەتی، پابەندبوونـەکان بخاتە ئەستۆی خۆیەوە[٧١].

لە وەلاّمـدا داواکـاری گشـتی، ئـەو بنەمایانـەی دادیـاری داکـۆکی بەبەڵگـە هێنابوویـەوە، رەتکردنەوە و لە سەر ئەم بنچینەیە داواکاری گشتی، هەڵیتەکاندن و نیشانی دا کە دادگەگەلی ئەلمانیا لێوەکۆڵینیان دەکرد نەك دادگاییکردن، دیارە لێوەکۆڵین و دادگاییکردنیش جیاوازن لـە

---

[٧٠] لە هاوینی ١٩٩٤ دا، لە ئۆفیسی داواکاری گشتی دەست بە لێکۆڵینەوە لە کیشەی تادیش کرا. لە ١٩٩٤/١٠/١١دا، داواکاری گشتی داوایەکی پێشکەش بە دادوەری دایرەی دادگایی یەکەم کرد تا دادگەی ئەلمانی ، واز لە دەستدانەکانی خۆی بۆ دادگەی نێودەوڵەتی بهێنێ، پاش ئەوەی کە لە شوباتی ١٩٩٤دا تادیك لە ئەلمانیا گیرا.

- ١٩٩٤/١١/٨، دادوەری دایرەی دادگایی یەکەم بە داخوازی دەسهەڵگرتن رازی بوو کە پێشکەش بە ئەلمانیا بکرێ.
- ١٩٩٥/٢/١٣، بە فەرمی تۆمەت ئاراستەی تادیك کرا.
- ١٩٩٥/٣/٣١، پارلەمانی ئەلمانیا، قانوونی هاوکاریکردن لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا پەشسند کرد.
- ١٩٩٥/٤/٢٤، تادیش لە ئەلمانیاوە گوازرایەوە بۆ بارەگای دادگەی نێودەوڵەتی.
- ١٩٩٥/٤/٧، بۆ یەکەمین جار تادیش لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا خۆی دیتەوە.
- ١٩٩٥/٥/٧، تادیش بە تاوانەکانی شەڕو تاوانەکانی دەرهەق بە مرۆڤایەتی تاوانبار کرا.

سەیری مێژووی کێشەی تادیش بکە لە:

I.C.T.Y, Bulletion, op, cit., No. 5-6, 24-4-1996, pp.1-4.

دەوڵەتان بە ئەلمانیاشەوە پابەندی هاوکاریکردن بوون لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا بە گوێرەی ماددەکانی (٢٥، ٤٨، ٤٩)ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ماددە ٢٩ (٢) ە ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی و رێسای/١٠ لە تابلۆی رێساگەلی دادڕەوییو رێساگەلی سەلماندن.

[٧١] I.C.T.Y, Defence Motion On Jurisdiction of the Tribunal, Case No, IT-94-1T, 23 June 1995, para.2.

I.C.T.Y, Defence Breif to Support the Notice (Introculory) Appeal, Case No. IT-94-I-AR72, 25 August 1995, para. 7.

گەڵ یەکدیدا[٧٢]. دادیاری داکۆکی سووربوو لەسەر ئەوەی کە بڕیاری دادگاییکردنێکی عادیلانە و پاکی تۆمەتپێکراو بەو شێوەیە نەدراوە کە مافی تۆمەتپێکراو لە بەرپرسیارەتیی تاوانکاری بپارێزێ وەکو لە دەقی بڕگە ٢ی مادده ١٠ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیدا[٧٣] هاتووە. داواکاری گشتی ئەوەشی روون کردەوە کە ئەم ماددەیە هیچ پێوەندییەکی بەم کێشەوەیە نییە، چونکە تۆمەتپێکراو لەسەر بنچینەی مادده ٩ی پێڕەوی ئەساسی لە بەردەم دادگەدا ئامادە نەبووە، بەڵکە بەپێی بڕگە ٣ی مادده ٩ی تابلۆی رێساگەلی دادڕەویی و رێساگەلی سەلماندن کە پەیوەستە بە لێوەکۆڵین و داواکاریی گشتی لەبەردەم دادگەی نێودەوڵەتیداو فاکتی تایبەتیان تێدایە. ئیدی لەبەر ئەم هۆیە، یان هۆیەکی تر کە لە مادده ١٠ی پێڕەوی ئەساسیدا هاتوون، داواکاری گشتی، تۆمەتپێکراوی بۆ دادگاییکردنەوەیەکی تازە رانەکێشاوەتە بەردەم دادگە، وەلێ ئەم بانگکردنە بە پێی تابلۆی ریساگەلی دادڕەویی بووە و دوای ئەوەی کە دادگەی نێودەوڵەتی تەماشای کردووە، مەرجەکان لە گۆڕێدان، ئەوجا داخوازیی دەستهەڵگرتن لە خۆوە پێڕەوی لێکراوە[٧٤].

---

[٧٢]I.C.T.Y, Decision of the Trial Chamber on the Application by the Prosecutor for a Formal Request for Defferral to the Competence of the International Tribunal in the Matter of Dusko Tadic, Case No. IT-94-I-D, 8 Nov, 1994, para. 8.
I.C.T.Y, Decision for the Appeal on Jurisdiction, op, cit, para. 5.2.

[٧٣] بە گوێرەی بڕگە ٢ ی ماددەی ١٠ی پێڕەوی ئەساسی، ناشێ دادگەی نێودەوڵەتی، کەسێك کە پێشتر لە بەردەم دادگەیەکی نیشتمانیدا لەسەر کاروکردەی پێشێلکارانەی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی دادگایی کرابێ، دادگایی بکاتەوە مەگەر:

١- ئەو کارەی حوکمی لەبارەوە دراوە، وەکو تاوانێکی ئاسایی سازێندرابێ.

٢- دادڕەوییەکانی تێڕوانینی کێشەکە لە بەردەم دادگەی نیشتمانیدا، بایەخگەلی پاك و بێگەردی و سەربەخۆبوونیان تێدا نەبێ، یان بۆ پاراستنی تۆمەتپێکراو لە بەرپرسیارەتی تاوانکاری ئاراستە کرابن، یان ئەوەتا داواکاری گشتی بە پێی پێویست دەوری خۆی نەبینیبێ.

[٧٤] بۆ حاڵیبوون لە میکانیزمی کاری داواکاری گشتی سەبارەت بە داخوازینامەی دەسهەڵگرتن، ئەوا رێساکانی ٨-١٠ لە تابلۆی رێساگەلی دادڕاییو رێساگەلی سەلماندن دەڵێن:

**رێسای ٨: زانیاریی داواکردن:**

"لە هەر جێیەك بۆ داواکاریی گشتی دەرکەوت کە ئەو تاوانەی دەکەوێتە نێو دەستدانی دادگەوە، یان دەبتە بابەتی لێوەکۆڵێتن، یان دەبتە بابەتی دادڕەویی تاوانکاری لە دادگای دەوڵەتێکدا، ئەوا دەشێ داخوازی لە دەوڵەتی تاین بکا کە هەر زانیارییەکی پێوەندیی بەم بابەتەوە هەیە، ئاراستەی ئەو بکاو دەوڵەتەکەش دەبێ و تا دەکرێ بلەز بە پێی مادده ٢٩ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی ئەم زانیاریانەی بۆ بنێرێ"

بە هەرحاڵ، وا پێدەچێ لە پێشتربوونی دادگەی نێودەوڵەتی لە گەڵ دوو پرەنسیپی سەرەکیدا ناکۆك بێ کە ئەمانەن:

١- سەروەریی دەوڵەتان و دەستدانی نێوخۆیی.

٢- مافی دادگاییکردنی تۆمەتپێکراو لەبەردەم دادگەگەلی نیشتمانیدا بەپێی قانوونی نیشتمانی.

## ١-٢-٣-١: سەروەریی دەوڵەتان و دەستدانی نیشتمانی

لەو ساتەی ددان بە سەربەخۆبوونی بۆسنیاو هەرسك نراوە، ئەوا بۆسنیاو هەرسك دەستدانی ئەوەی هەیە دادگە بۆ دادگاییکردنی ئەو تاوانانەی لە هەرێمی ئەودا ئەنجامدراون[٧٥]، دابنێ. وەکو فاکتێکی گرنگ، دەوڵەتی بۆسنیا و هەرسك تەنیا لەڕاست تاوانگەلی ئاساییدا بەپێی قانوونی سزادانی نیشتمانی پراکتیزەی دەستدانی خۆی ناکا، بەڵکە هەروا دەشێ سەبارەت بەو

---

**ڕێسای ٩: داخوازیی داواکاری گشتی سەبارەت بە دەسهەڵگرتن**

"هەر کاتێ بۆ داواکاری گشتی دەرکەوێ کە لێوەکۆڵینی لەم بابەتە، یان دادڕەویی تاوانکاری لە بەردەم دادگەی دەوڵەتێکدا بە ڕێوە چووە:

١- ئەگەر کارکردن لە لێوەکۆڵینەکە، یان بابەتی لێوەکۆلینەکە وەکو تاوانتێکی ئاسایی پۆلین کرا بێ، یان،

٢- کێماسی لە نا بێلایەنی و سەربەخۆبوون، یان لێوەکۆلین و دادڕەوییە تاوانکارییەکان بۆ پاراستنی تاوانبارکراو لە بەرپرسسیارەتی تاوانکاری داڕێژراوبوون، یان ئەوەتا هەولۆ تەقەلا، یان بایەخدانی پێویست لە لایەن داواکاری گشتییەوە نەدرابێ.

٣- ئەگەر کێشەکە پێوەندیی نزیك، یان لە فاکتگەلی تایبەت و قانوونی پیکهاتبێ و پێوەندیی بەو لێوەکۆڵینە هەبێ کە داواکاری گشتی لە دادگەی نێودەوڵەتی پێی رابووە.

ئەو دەمە داواکاری گشتی دەشێ داوا لە دایرەکانی دادگە بکا کە داخوازینامەی فەرمی دەسهەڵگرتن لە دەستدانەکانی بۆ دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی پێشکێش بکا"

**ڕێسای ١٠: داخوازینامەی فەرمی دەسهەڵگرتن**

١- ئەگەر بۆ ئەو دایرەی دادگاییکردنەی کە کێشەکەی لەبەردەمە، دەرکەوت، بە گوێرەی هەرکام لەو بناغانەی لە ڕێسای ٩دا هاتوون، کەوا دەسهەڵگرتن ڕێوشوینێکی لەبارە، ئەوا دایرەی دادگاییکردن بۆی هەیە داخوازینامەیەکی فەرمی دەسهەڵگرتن دەربکا.

٢- داخوازینامەی دەسهەڵگرتن، داوای ئاکامی لێوەکۆڵین و کۆپییەك لە تۆمارەکانی دادگەکەو بڕیارەکە دەکا، ئەگەر پێشتر ئەو زانیاریانە بە دادگەی نێودەوڵەتی نەدرابن"

[٧٥] لە دیدو تێڕوانینی دادیاری داکۆکییەوە، ئەمە ڕەوتارێك بووە بۆ تانەدان لە دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی لە بەردەم دایرەی تێهەڵچوونەوەدا.
I.C.T.Y, Defence Breif to Support the Notice (Introculory) Appeal, Case No. IT-94-I-AR72, 25 August 1995, para. 7.

تاوان و پێشێلکارییانەی دەرهەق مرۆڤایـەتیش کـراون، پراکتیـزەی دەسـتدانی خـۆی بکـات. مایەی خۆتێکردنی دادگەی نێودەوڵەتیش لە گـەڵ پـەیمانی UN دا دژبـەرە[٧٦]، چـونکە هـیچ دەوڵەتێك، یان سازمانێك مافی ئەوەی نییە دادگـایی ئـەو تاوانانـە بکـات کـە لـە هـەرێمی دەوڵـەتێکی دیـدا ئەنجامـدرابن، پێکهێنـانی دادگـەی نێودەوڵـەتی و مایـەی خـۆتێکردن لـە دەستدانی دادگەگەلی نیشـتمانیدا، پێشـێلکردنی سـەروەریی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆو مایـەی خۆتێکردن لە کاروباری نێوخۆیی ئەو دەوڵەتەی لێ‌دەکەوێتەوە[٧٧].

هەروابێتەوە سەروەریی دەوڵەتان، مافێکی بێ ئەملاو ئەولای دەوڵـەتان خۆیانـەو، دەوڵـەتانی سەروەریش تەنیا خۆیان بۆیان هەیە پرسی مایەی خۆتێکردن لە کاروبـاری نێوخـۆی خۆیانـدا ، یان پێشێلکردنی سەروەریی خۆیان بوروژێنن، هیچ تۆمەتپێکراوێك مافی وروژانـدنی پرسـێکی ئاواهی نییە[٧٨].

هەروابێتەوە بۆسنیاو هەرسك خۆی ئەم بابەتەی نەهێنایە گۆڕێ و ئەمـەش کـێش و قورسـایی بنـەمای قانوونیانـەی هەیـە. دیـارە تۆمـەتپێکراویش بـەرعۆدەی دەسـەلاٚتی دادوەرییـەکی نیشتمانیی ئەوتۆیە کە بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە سـەروەری تـا ئـەو پەڕەکـەی پـیرۆز بـوو، نەدەکرا کەس لێی کەمبکاتەوە. لە وەسـفکردنی تـازەی دەوڵەتانـدا، ئـەم چـەمکە لـە سـەر بنچینەی دیموکراسی لە کۆمەڵگاکانی دیموکراتیکدا نەمازە لە بواری مـافی مرۆڤـدا، گـۆڕانی بەسەردا هاتووە[٧٩].

---

[٧٦] دەقی بڕگەی ١ لە مادده ٢ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەوەیە:

"ئەم دەستەیەو ئەندامەکانی لە کۆششیاندا لە پێناو ئەو مەرامانەی لە مادده ١ دا هاتوون بە پێی ئەم پرەنسیپانەی خوارەوە کار دەکەن:

١- ئەم دەستەیە لەسەر پرەنسیپی وەکیەکی لە سەروەریدا لە نێوان هەموو ئەندامەکانیدا، رۆنراوە.

[٧٧] I.C.T.Y, Decision for the Appeal on Jurisdiction of the Tribunal, Case No, IT-94-1T, 10 August 1995, para. 41

[٧٨] ئەم پرەنسیپە بەم دواییە لە دادخوازیی ئەمریکا دژی نۆریگا خویا بوو کە یەکێ لە دادگاکانی ئەمریکا لە فلۆریدا بڕیاری لێدا و نیشانی دا (وەکو پرەنسیپێکی گشتیی قانوونی نێودەوڵەتی، تاکە کەسان لە کێشەی پێشێلکاریی رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا لە حاڵەتی نەبوونی نارەزایی دەوڵەتێکی خودان سەروەری، مافی کێشەکردنیان نییە).
United States V. Noriega, 746, F. Supp, 1506, 1533 (S.D.Fla, 1990), U.S.A.
لە بڕیاری دایرەی تێهەڵچوونەوەدا هاتووە:

I.C.T.Y, Decision for the Appeal on Jurisdiction, op, cit, para 55, (3) Ibid, para, 56.

[٧٩] Ibid, para, 56.

دادیاری داکۆکی پەنای بۆ بڕگە ٧ی مادده ٢ی پەیمانی UN بردووە[٨٠] و بەڵگەی بە بەشی یەکەمی ئەم بڕگەیە هێنابۆوە، لە کاتێکدا بەشی دووەمی بڕگەکە ساغی دەکاتەوە کە ئەم بڕگەیە لە کاتێکدا، ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی دەسەلاَتەکانی فەسڵی حەفتەم دەجولێتەوە، جێبەجێ نابێ، ئەمە سەرباری ئەوەی کە سروشتی تاوانگەلە ئەنجامدراوەکان تەنیا خەمی ئەم، یان ئەو دەوڵەت نین، بەڵکە سەرلەبەری جیهان بە پەرۆش و بەتەنگیانەوەن.

ئەنجوومەنی ئاسایش بەو پێیەی دەستەیەکە سروشتێکی جێبەجێکاری هەیە، ئەو مافەی پێدراوە لەو کێشانەی سروشتێکی ناوەکیان هەیەو هەڕەشە لە ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی دەکەن، دەخالەت بکا. لەو حەلەدا چەمکی سەروەریی دەوڵەتان لە بەردەم پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤدا دەکەوێتە ئەو لاوەو، شان بە شانی، دانەنانی سەروەری وەکو سوپەرێك لە رێگەی جێبەجێکردنی قانوون و پاراستنی ئەو کەسانەی پێ لە گرنگترین توخمەکانی مرۆڤایەتی دەنێن[٨١].

لەراستیدا، لە کاتی پێکهێنانی دادگەی نێودەوڵەتیدا، ئەم دادگەیە دەبوایە مافی لە پێشتربوونی خۆی بەسەر دادگەگەلی نیشتمانی پێبدرایە، لە ئالەکی دییەوە، کارێکی ترسناکە ئەگەر تاوانگەلی نێودەوڵەتی وەکو تاوانگەلی ئاسایی پۆلین بکرێن، مادامەکێ دادگەی نێودەوڵەتی لە چوارچێوەی ئاقاری مادده ٩ و ١٠ی پێڕەوی ئەساسی و بنەماکانی ٨-١٠ی

---

[٨٠] لە بڕگەی ٧ی مادده ٢ی پەیمانی UN هاتووە:

"لەم پەیمانەدا شتێ نییە پاساو بە UN بدا، کە دەست لەو کاروبارانە وەربدا کە دەکەونە دوڕ دەسەڵاتی ناوەخۆی دەوڵەتەوە، شتێکیش نییە کە بخوازێت ئەندامانی UN پرسگەلێکی لەم بابەتە بخەنە بەردەم UNەوە تا بە گوێرەی ئەم پەیمانە چارەسەر بکرێ. وێڕای ئەوەی کە ئەم پرەنسیپە رێگە لە پراکتیزەکردنی رێوشوێنەکانی داپلۆسین کە لە فەسڵی حەفتەمدا هاتوون، ناگرێ".

بۆ زێتر وردبوونەوە لە دەستدانی نیشتمانی دەوڵەتان و دیاریکردنی ناوەرۆکی وردی قانوونیانەی ئایدیای دەسەلاَتی ناوەخۆ بگەڕێوە بۆ:

د. محمد سامی عبد الحمید، العلاقات الدولية، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٤، ص ٢٨٩ و بەدواوە.

[٨١] دادگای باڵای سەربازیی ئیتالیا لە کێشەی جەنرال وانگەر لە ساڵی ١٩٥٠دا دیاریکرد کە "ئەم پرەنسیپانەی (کە پێوەندییان بە تاوانەکانی دژ بە قانوون و نەریتەکانی شەڕو سروشتێکی نامرۆڤانەو رەگەزپەرستانەیان هەیە) سروشتێکی جیهانیان هەیە نەك تەنیا هەرێمایەتی".

I.C.T.Y, Decision for the Appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 57.

بەم زوانە، دادگای تەمییزی فەرەنسی، بڕیاری دادگایەکی بەڕاست گەڕاند کە ئەم بڕگەیەی تێدا بووە:

"بەهۆی سروشتی تاوانەکانی دەرهەق بە مرۆڤایەتی، هەروا سوك و ئاسان ناکەونە نێو ئاقاری قانوونی فەرەنسیی پەیوەست بە کاروباری ناوەخۆی وڵات، بەڵکە بابەتی قانوونی نێودەوڵەتییە کە بە بوارێکی تازە دادەنرێ (یان تا ئەوەی ئێستا پێی گەییوە) و بنەمای سوننەتی لە بەردەم ئەم بنەماگەلە بیانیانە لادەچن"

Revue enerale de droit International public, o, 88, 60 ct, 1984, p. 509.

تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی و ڕێساگەلی سەلماندن کاری خۆی دەکا و ئەو تاوانانەی دەکەونە نێو دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتییەوە، ئەو تاوانانەن کە سروشتێکی جیهانییان هەیەو لە قانوونی نێودەوڵەتیدا وەکو پێشێلکاریی مەترسیداری قانوونی نێودەوڵەتی مرۆیی و مافەکانی مرۆڤ ددانیان پێدانراوە و جێگەی بایەخی هەموو دەوڵەتانن. ئا لە هەلومەرجی ئاوادا، دادگەی نێودەوڵەتیی، پێیوایە مافی سەروەریی دەوڵەتان ناشێ و نابێ لە مافی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەپێشتر بێ کە وەکو شوێنەواری ئەو شۆکەی بەر ویژدانی هەموو نەتەوەکانی دنیا کەوتووە، کاری خۆی دەکا، لە سەرینی ئەمەوە لاریی لەوە نییە کە دادگەی نێودەوڵەتی بە ناوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، ئەم تاوانانە دادگایی بکا[٨٢].

### ١-٢-٣-٢: مافی دادگاییکردنی تۆمەتپێکراو لە بەردەم دادگەگەلی نیشتمانی بە پێی قانوونی نیشتمانی

ئەم مافە بە پرەنسیپی ( Jus de non evocando) ناسراوەو لە دۆکیۆمێنتی نێودەوڵەتیی مافەکانی مرۆڤ و بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان پەسندکراوەو جێگەی بۆ کراوەتەوە، وەلێ داخوا لە کاتی دانانی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیدا ئەم مافە پێشێلکراوە یان نا؟

ئەم مافە لە لایان ئەنجوومەنی ئاسایشەوە پێشێل نەکراوە، چونکە کاتێ ئەنجوومەن، ئەم دەستدانەی بۆ دادگەی نێودەوڵەتی کە بە ناوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە کار دەکا، گواستووەتەوە، تۆمەتپێکراو بە پێی دۆکیومێنتە نێودەوڵەتییەکان هەموو گەرەنتییەکی بۆ دەستەبەر کراوە.

وێدەچێ، دادیاری داکۆکی لە ڕێگەی تانەدان لە لەپێشتربوونی دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتییەوە ئامانجێکی دیاریکراوی کردبێتە نیشان. ئەمیش خۆبواردنە لە پێکهێنانی دادگەگەلی تایبەتی، یان نائاسایی بۆ دادگاییکردنی تاوانگەلی سیاسی، لە کاتی بشێوی و تێهەڵچوونی کۆمەلاّیەتی بەبێ دەستەبەرکردنی گەرەنتییەکانی داداگاییکردنێکی عادیلانە[٨٣]،

---

[٨٢] لە بڕیاری دادگەکەدا هاتووە:

"روون و خویایە، کە پرسی بەرتری لە کێشەی تادیشدا، لە دژی دوو دەوڵەتی خودان سەروەری وروژێندرا: بۆسنیاو هەرسك و ئەلمانیا، یەکەمینیان تاوانی لەسەر قەیدکراوی تێدا ئەنجامدراوە و لە دووەمیشیاندا، لەوێ گومانلێکراو بەم تاوانە دەسگیر کرا، دیاریکردنی دەستدان نابتە مافی گومانلێکراو تا یەکێ لە دادگاکان هەڵببژێرێ تا لە بەردەمیدا دادگایی بکرێ، چونکە ئەمە پێچەوانەو دژە لە گەڵ پرەنسیپەکانی دەستدانی تاوانکاری".

I.C.T.Y, Decision for the Appeal on Jurisdiction of the Tribunal, Case No, IT-94-1T, 10 August 1995, para. 41

[٨٣] بۆ پشتڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکانی، دادیاری داکۆکی بەڵگەی بە ٧ دەستووری نیشتمانی لە سەرانسەری جیهان هێنایەوە: ماددە ١٧ی دەستووری هۆلەند، ماددە١٠١ی دەستووری ئەلمانیا، ماددە ١٣ی دەستوری بەلجیکا، ماددە ٢٥ی دەستووری ئیتالیا، ماددە ٢٤ی دەستووری ئیسپانیا، ماددە ١٠ی دەستووری سورینام و ماددە ٣ی دەستووری فەنزویللا.

ئەگەر ماددە ١٣ی دەستووری بەلجیکامان وەرگرت، دەبینین دەقەکەی ئەمەیە:

بەڵام تۆمەتپێکراو هەموو گەرەنتییەکی بە شێوەیەکی ئەوتۆ بۆ دەستەبەر کراوە کە هەندێك پێیانوایە بە بەراورد لە گەڵ ئەو تاوانانەی لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون و ئەو هەزاران هەزارەی بوونەتە قوربانیی ئەم تاوانانە[٨٤]، زێدەڕۆیی کراوە.

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەستی کردووە بە دانان بەوەی کە کەسی گومانلێکراو دەشێ لە بەردەم دادگایەکی نێودەوڵەتیدا سەبارەت بە جۆری ئەو تاوانگەلە نێودەوڵەتییەی بەرەو رووی کراوەتەوە، دادگایی بکرێ، دادگەش گەرەنتی سەرەکی دابین بکا وەکو جیاوازی نەکردن و دەسپاکی و راست و رەوانی و دانانی دادوەری وا کە سەر بە سیستەمی قانوونیی جیهانی جیا-جیا بن و لە سەر بنەماو بنچینەی دیاریکراو، دادگە کاری خۆی بکا[٨٥].

دایرەی تێهەڵچوونەوە لە بڕیارێکدا ئەو هۆیانەی دادیاری داکۆکی، بۆ تانەدان لە ( لەپێشتربوونی دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی) پێشکێشی کردبوون، رەتکردەوە[٨٦].

---

" ناشێ کەسێك لە دادوەرییەکی دیاریکراو وەربگیرێتەوە بە گوێرەی قانوون.." و بنەمای دەستوورەکانی تریش، یان ئەوەتا هاوشێوەی ئەم بنچینەیە، یان ئەوەتا رەوایی نادەن بە قەدەخەکردنی گومانلێکراو کە لە لایەن دادوەری نیشتمانیی دیاریکراوەوە، دادگایی بکرێ بە گوێرەی قانوون.

[٨٤] Pellet, op, cit, p. 47.

[٨٥] گرنگترین ئەم بنچینانە بریتین لە دوورخستنەوەی دەستێوەردانی سیاسی، مەبەستمان لەمە کارتێکردنە لە بڕیارەکانی دادگە نێودەوڵەتییەکان، هۆکارە سیاسییەکان لە هەموو بوارەکاندا دەوریان هەیە، بۆ نمونە تێبینی دەکرێ لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، پێ لەسەر پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە هەندێ وڵاتدا دادەگیرێ و چاو لە پێشێلکاری لە وڵاتانی دی دەپۆشرێ. ئا ئەمە بەسەر تەواوی دەوڵەتانی جیهاندا جێبەجێ دەبێ. ئەگەر ئەم دەستێوەردانە سیاسییە، لە شان و شکۆ و ریزی دادگەی نێودەوڵەتی کەم بکاتەوە و لە ئامانجە رەسەنەکانی خۆی دووری بخاتەوە، لەوانەیە بیکا بە دەستاوێژێك بۆ وەدیهێنانی ئارمانجگەلێکی سیاسی، لە گەڵ ئەوەشدا نابێ رەشبین بین لە راست دامەزرانی دەزگایەکی دادوەری نێودەوڵەتیی سەربەخۆ، چونکە ئایدیای دادوەری لە چوارچێوەی قانوونی نێوخۆییەوە پەڕیوەتەوە ناو سیستەمی قانوونی نێودەوڵەتی و وەکو چۆن لە چوارچێوەی قانوونی نێوخۆدا پەرەسەندنی یەك بەدوای یەکی بە خۆوە بینیوە، چار نییە ئەم پەرەسەندنانە لە چوارچێوەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکانیشدا دێنە کایەوە.

لە هەموو بارێکدا،هەر هەڵسەنگاندێکی ئەم پرسە، ناشێ لە چوارچێوەیەکی کراوەدا بکرێ، چار نییە، دەبێ ئەرکی دادگەکە و دەستدانەکانی بە پێی مەوداو ئاقاری بەرتەسککردنەوەی سەروەریی دەوڵەتان لەم بوارەدا، دیاری بکرێ.

[٨٦] لە بڕیارەکەدا هاتووە:

"لەبەر ئەم هۆیانە، دایرەی تێهەڵچوونەوە، بەو دەرەنجامە گەیشتووە کە بنچینەی دووەمی تێهەڵچۆرەوە لە تێهەڵچوونەوەکەیدا کە پەیوەستە بە بەرتری دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی، کزو لاوازەو دەبێ رەت بکرێتەوە"

I.C.T.Y, Decision for the appeal on jurisdiction, op, cit., par., 64.

## فەسڵی دووەم

# پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی

بۆ ماوەی نیو سەدە، دادگاکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆ و دادگە نیشتمانییەکان لە شەڕی دووەمی جیهاندا، شایەتی سەرەکی بوون لەسەر دادگاییکردنی تاوانکاریی پەیوەست بە تاوانگەلی نێودەوڵەتی دەرهەق بە پرەنسیپە بنچینەییەکانی قانوونی نێودەوڵەتی مرۆیی، وێڕای کە لەم دادگایانەدا تەنیا هاووڵاتی وڵاتە دۆڕاوەکان دەدرانە دادگاوە١.

کاروکردەی زایۆنیزم لە فەلەستینی داگیرکراودا و کردەوەی دی لە نێو ئەو کردەوە هوڤییانەدان کە بەبێ سزادان ماونەتەوە جا چ لە لایان دادگەگەلی نێودەوڵەتییەوە بێ یان ناوخۆیی. هەندێ لە پەیماننامەکان ، حوکمگەلێکیان تێدایە کە رێگە بۆ دادگا نیشتمانییەکان دەکەنەوە، تاوانگەلێکی کە بایەخی جیهانیان هەیە، دادگایی بکەن، وەلێ ئەگەر هەندێ حاڵەتی کەمی لێ دەربچێ، دەنا پێڕەوی لەم پەیماننامانە نەکراوە[٢]. لە گەڵ ئەوەشدا و سەرباری لەبەرچاونەبوونی گرنگیی دادگاییەکان، هاودەنگییەك لە بارەی رەوایی پرەنسیپەکانی نۆرمبێرگ هەیە کە پرەنسیپێکن بەسەر دەستدانی جیهانیی تاوانگەلی نێودەوڵەتیدا جێبەجێ دەبن[٣].

---

[1]- Theodor Meron, International Criminalization for Internal atrocities, op, cit. P. 554.

[2]- J.C.O, Brien, The International Tribunal For Violations of International Humanitarian Law in
The Former Yugoslavia, AJIL, Vol. 87, 1993, p. 639.

[3]- H.P, Gasser, International Humanitarian Law, An Introduction, Henry Dunant Institute, Haupt, 1993, pp. 84-90.

ئیدی بەکاوەخۆ پێویستیی سزادانی ئەو کەسانەی لە پێشێلکارییە ترسناکەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بەرپرسیارن، دەچەسپێ، پەیماننامەکان هەر خۆیان بەس نین، بەڵکە دڵنیابوون لە ریزگرتن لەم پەیماننامانە پێویستە، دەبێ هەمیشە ئەوەمان لە یاد بێ کە دەوڵەتان هەر لە نوکەوە بەرپرسن لە ریزگرتن لە قانوونی نێودەوڵەتی، نەمازە ریزگرتن لەو پەیماننامانەی خۆیان مۆریان کردووەو ئەندامن تیایدا[٤] . لێ ئەو سیستەمە سیاسییانەی لەو دەوڵەتانەدا کاروکردەی دڕندانە ئەنجام دەدەن، لەوانە نیین پێ لە هەڵەی خۆیان بنێن و ددانی پێدا بنێنن و سزای ئەوانەش بدەن کە لەم کردەوانە بەرپرسن، ئیدی سەختترین ئاریشەیەك هەوکی قانوونی نێودەوڵەتی گرتبێ ئەوەیە کە دەسەڵاتێك نییە لە سەرووی دەوڵەتانەوە بێ. ئەمەش وایکردووە گرفت لە جێبەجێکردنی سزا هەبێ دەرهەق بەو لایەنەی بنەمایەکی قانوونی پێشێلکردووە چ دەوڵەت بێ، یان تاکە کەس[٥].

ئەو کردەوە جەرگبڕو قێزەونانەی لە یۆگۆسلافیای جاران و دواتر لە رواندا روویاندا، لە هەموو جێگەیەکدا ویژدانی جیهانیان هەژاند، زەنگێك بوون کە توانی لە ماوەیەکی کورتخایاندا، گەورەترین پەرەئەستاندنی تایبەت و سەربەخۆی قانوونی بهێنێتە ئارا،

---

[٤] بۆ نموونە دەبینین رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف، راست و راست تەنیا داوا لە دەوڵەتان ناکەن ریز لەو رێککەوتننامانە بگرن، بەڵکە داواشیان لێ دەکەن کە ریزگرتنیشیان دابین بکەن، دەقی ماددەی یەکەمی هاوبەشی نێوان ئەم رێککەوتننامانە دەڵێ:

"لایەنە رێککەوتووە باڵاکان بەڵێن و سۆز دەدەن کە ریزی ئەم رێککەوتننامەیە بگرن و لە هەموو بارێکدا دەستەبەری رێزگرتنی بکەن"

هەروا بێتەوە بڕگەی ١ ماددە ١ی پرۆتۆکۆلی زێدەکراو بۆ رێککەوتننامەکانی جنێف کە پەیوەستە بە پاراستنی قوربانیانی ململانێی چەکدارانەی نێودەوڵەتی، دەڵێ:

"لایەنە رێککەوتووە باڵاکان بەڵێن دەدەن کە لە هەموو بارێکدا ریزی ئەم پرۆتۆکۆلە بگرن و ریزگرتنی بسەپێنن"

[5]- Stanislav E. Nahlik, op, cit., p. 39.

ئەنجوومەنی ئاسایش توانی بە گوێرەی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی UN ، پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران و پاش ئەویش بۆ رواندا دەربکات[٦].

ئەم پەرەئەستاندنانە، دەرفەت بۆ لێوردبوونەوەو شیکردنەوەی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران دەکەنەوەو هەلێك بۆ تێروانین لە سەمت و ئایندەی گەشەسەندنی قانوونی نێودەوڵەتی سەبارەت بە سزادانی تاوانگەلە نێودەوڵەتییە ئەنجامدراوەکان لە ململانەیە چەکدارییەکاندا دەرەخسێنن.

پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران بە پراکتیزەکردنێکی بەڕاستیی رێساکانی پارێزوانی لە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی و قانوونی مافەکانی مرۆڤدا بە ئەژمار دێت. بە تایبەتی لە بواری دەستدانی دادگەکەوە،

---

[٦] ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی بڕیاری ٩٥٥ ی ١٩٩٤/١١/٨، پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە رواندای پەسند کرد کە دوای ئەوەی سکرتێری گشتی بە پێی بڕگەی ٣ی بڕیاری ٩٣٥ی رۆژی ١٩٩٤/٧/١ و نامەی رۆژی ١٩٩٤/٧/٢٩ راپۆرتێکی بە ئەنجوومەن دا، هەروا سکرتێری گشتی، ئەنجوومەنی لە دوو راپۆرتی دیش ئاگادارکردەوە" راپۆرتی بڕیاردەری تایبەت بەرواندا سەر بە لیژنەی مافەکانی مرۆڤ و راپۆرتی لیژنەی کارناسان کە بە پێی نامەی سکرتێری گشتی لە ١٩٩٤/١٠/١ بە ئەنجوومەن درا. هەروا لەسەر داخوازی حکوومەتی رواندا، ئەنجوومەن بڕیاری دا بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی UN دادگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ یەك مەبەست دابمەزرێنیٚ، ئەویش دادگاییکردنی ئەوانەیە کە لە کاروکردەی جینۆسایدو پێشێلکارییە زل و زەقەکانی تری قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی لە هەرێمی رواندا بەرپرسن و ئەو هاووڵاتییە رواندییانەی لە کاروکردەی جینۆسایدو پێشێلکاری تری هاوشێوە بەرپرسن کە لە دەوڵەتانی دراوسیٚ لە ماوەی نێوان ١٩٩٤/١/١- ١٩٩٤/١٢/٣١دا ئەنجامدراون. بۆ وەدیهێنانی ئەم مەبەستە ئەنجوومەن پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی بۆ رواندا کە لە ٣٢ مادده پێکهاتووە بڕیار دا، بیٚ لە دەستدان و بارەگای دادگەکەو خەرجییەکانی، دەنا ماددەکانی تری دادگەی نێودەوڵەتی بۆ رواندا، هەر هەمان ماددەکانی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جارانە.

بگەڕێوە بۆ پاشکۆی ژمارە (٥) لە کۆتایی ئەم باسەدا کە تیایدا لایەنە جیاوازو وێکچووەکانی نێوان هەردوو دادگەی نێودەوڵەتیی روانداو یۆگۆسلافیا روونکراوەتەوە.٠٠٠

بنەماگەلێکی تێدایە. سکرتێری گشتیی UN پێڕەوی ئەساسیی دادگەکەی بەشێوەی گەڵاڵەنامەیەك بە هەندێ تێبینی و راڤەی روونکاریی کورت دەربارەی هەر ماددەیەك لە ماددەکانی ئەو نیزامە ئەساسییە پێشکێش کردو لە بەرایی راپۆرتەکەیدا ئاماژەی بۆ بنچینەی قانوونیی ئەو دادگە نێودەوڵەتییە کردووەو چەند بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایشیشی لەمەڕ ململانەی ناو یۆگۆسلافیای جاران بەبەڵگە هێناوەتەوە یاد و لەم کێشە تایبەتەدا، نیشانی داوە کە ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی فەسڵی حەفتەم، دەستەیەکی لاوەکی بە پشتبەستن بە مادده ٢٩ی پەیمان UN، دادەمەزرێنێ، وەلێ ئەم دەستەیە سروشت و مۆرکێکی دادوەری هەیە. ئەم دەستەیە ئەرك و فەرمانەکانی خۆی بەشیوەیەکی سەربەخۆ لە بایەخ و هۆکاری سیاسی جێبەجێ دەکات و بۆ راپەڕاندنی فەرمانە دادوەرییەکانی خۆی کە بۆ ماوەیەکی کاتی بەردەوام دەبێ، تا ئاشتی و تەنایی نێودەوڵەتی بۆ باری جارانی خۆی لە یۆگۆسلافیای جاران دەگەڕێتەوە بە پێی بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش خۆی، لەژێر کۆنترۆلی ئەنجوومەنی ئاسایش دانابێ[٧].

سکرتێری گشتی، پێڕەوێکی ئەساسیی ٣٤ ماددەیی کە بەسەر حەفت دەروازەدا بەشکرابوون، پێشکێشکرد. دەروازەی یەکەم لەبارەی بنچینەی قانوونیی دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی و، دەروازەی دووەم سەبارەت بە دەستدانی دادگەکەیە، سێیەمیش لەبارەی رێکخستنی دادگەو، چوارەی لەبارەی لێوەکۆڵین و دادڕەویی بەراییەوەیە، پێنجەم دادگاییکردن و دادڕەوییەکانی دوای دادگایی، هەرچی شەشەم و حەفتەمیشن ئەوا لەبارەی پرەنسیپە گشتییەکانەوەن.

ئیدی بەم شێوەیە پێڕەوە ئەساسییەکەی سکرتێری گشتی UN هەر سێ دەزگا سەرەکییەکەی تێدایە کە دەبێ لە هەر سیستەمێکی دادوەریدا هەبن: دەستەی دادوەری، دەستەی داواکاری، قەڵەمی دادگە. بەبێ ئەم سێ دەزگایانە بەسەریەکەوە ناتواندرێ هزری پێکهاتەیەکی دادوەری نێودەوڵەتی تەواو، با ئەو دادگەیە تایبەتیش بێ، بکرێ.

[٧] نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ٣/٥/ ١٩٩٣ی سکرتێری گشتی ، سەرچاوەی پێشوو.

## ٢-١: دەزگاکانی دادگە

ڕێکخستنی دادگەی نێودەوڵەتی ڕەنگدانەوەی ئەو ئەرك و فەرمانانەیە کە لـە ئەسـتۆی خۆی گرتوون. لەبەرئـەوەی دادگـەی نێودەوڵـەتی، ئـەو کەسـانە دادگـایی دەکـات کـە بەرپرسـیارن لـە پێشـێلکارییە مەترسـیدارەکانی قـانوونی نێودەوڵـەتیی مرۆیـی لـە یۆگۆسلافیای جاران، سروشتی دادوەریی وا دەخوازێ دادگەکە، لەو دەزگایانـە پێکبێـت کە دەبێ لە ئاقاری هەر دادوەرییەکی نێودەوڵـەتیی تاوانکاریـدا هـەبن: واتـە دەسـتەی دادوەری، دەستەی داواکاری و قەڵەمی دادگە.

پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسـلافیای جـاران لـە مادده ١١-ەوە تا مادده ٣٤ی تەرخانکردووە بـۆ ڕوونکردنـەوەی دەزگاکـانی دادگـە و دادڕەوییەکان و مەسەلەی دی هاوپێوەند، وێدەچێ لە ڕێگەی ئەم پێڕەوی ئەساسـییەوە، ویستراوە ببێ بە نموونەیەك بـۆ چـاو لێکـردن کـە پێـڕەوی ئەساسـی هـەر دادگەیـەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت مفای لێببینێ، ئەمەش لە دوتـۆیی ئاکـارو ڕەوتـاری دانانی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵـەتیی تاوانکـاریی تایبـەت بـە یۆگۆسـلافیای جارانەوە تێبینی دەکرێ بە شێوەیەك کە ئەم ڕەوتارو ئاکارە لـە هـەر دادگاییکردنێکـدا دەبێ بە تەواوی لە گەڵ چەمکە نوێباوەکانی قانوونی نێودەوڵـەتی تێکبکاتـەوە. داخـوا دەکرێ لە دیماهیی سەدەی بیسـتەمدا، دادگەیـەکی نێودەوڵـەتیی تاوانکـاریی تایبـەت دابندرێ بەبێ ئەوەی ڕەوتاری دادگاییکردن و پێکهاتەکەی بە شێوەیەکی تەواو لـە گـەڵ چەمکە تازەکانی قانوونی نێودەوڵەتیدا ڕێ نەکەن؟

ناشێ و ناکرێ دادگایی کردنێکی دادپەروەرانەو چاك و بێگەرد بەڕێوە بچێ بەبێ ئـەوەی کـە ڕێسـاگەلێکی دیـاریکراو دەسـتەباریان بـێ، هـەروەکو لـە دەقـی ڕێککەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکانی وەك بەڵێننامـەی نێودەوڵـەتیی تایبـەت بـە مافـە مـەدەنی و سیاسییەکان نووسراونەتەوە.

بوونی بنچینەو گەرەنتی قانوونی کە لە سەر پرەنسیپەکانی سەروەریی قانوون دامەزرابن و تا دەکرێ لە هۆکاری سیاسی ئازاد بن، بناخەی هەر دامەزراوەیەکی دادوەریی پاك و بێگەردە[8].

**٢-١-١: دەستەکانی دادگەکە**

مادده ١١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران، دەستەکانی دادگەکە بەم شێوەیە دەخاتەروو:

دایرەکان: دوو دادگە بۆ دادگاییکردن و یەکێکیش بۆ تێهەڵچوونەوە.

ئۆفیسی داواکاری گشتی.

قەڵەمی هاوبەشی دایرەکان و ئۆفیسی داواکاری گشتی.

**٢-١-١-١: دایرەکانی دادگە:**

بەپێی مادده ١٢ی پێڕەوی ئەساسی، دادگەی نێودەوڵەتی ١١ دادوەری هەن و بە گوێرەی مادده ١١ش ئەم دادوەرانە بەسەر سێ دایرەدا دابەشکراون. هەر دایرەیەك لە دایرەکانی دادگاییکردن ، سێ دادوەری هەیە، کەچی دایرەی تێهەڵچوونەوە بە تەنیا (٥) دادوەری هەن و نابێ هەردوو دادوەر هاوڵاتی یەك دەوڵەت بن. لە رێگەی میکانیزمێکی دیاریکراوەوە دادوەرەکان هەڵدەبژێردرێن. سکرتێری گشتیی UN داوا لە دەوڵەتانی ئەندام لە UN و دەوڵەتانی نائەندام دەکا، ئەوانەی کە نێردەی چاوەدێریی هەمیشەییان لە بنکەی UN دا هەیە، کەسایەتی خۆیان بۆ پلەی دادوەری دادگە بپاڵێون

[8] نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٤٨، راپۆرتی لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتی لە بارەی کارەکانی خولی ٤٥، ٣ ئایار- ٢٣ی تەمموز ١٩٩٣، دۆکیومێنتی A/48/10، ل ١٩.

و دەبێ لە ماوەی ٦٠ ڕۆژ لەو داوایەی سکرتێری گشتییەوە، هەر دەوڵەتێك دوو کاندیدی خۆی کە هەریەکەیان ڕەگەزنامەی جیای لەوی دی هەبێ ناودێر بکاو سکرتێری گشتیش ناوی ئەو کاندیدانە، بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش دەنێرێ. ئەو ژی لە نێو ئەو کاندیدانە، لیستێك ئامادە دەکا کە نابێ لە ٢٢ کاندید کەمتری و لە ٣٣ کاندیدیش زۆرتر بێ بە مەرجێ ڕەچاوی نوێنەرایەتیکردنێکی گونجاوی سیستەمە قانوونییە سەرەکییەکانی دنیای تێدا بکرێ٩.

ئەنجوومەنی ئاسایش، لیستی ناوەکان بۆ سەرۆکی کۆمەڵەی گشتیی UN دەنێرێ و کۆمەڵەی گشتیش لەو لیستەی ئەنجوومەنی ئاسایش ئامادەی کردووە، ١١ دادوەر هەڵدەبژێرێ. لە حاڵەتی ڤالابووندا، سکرتێری گشتی دوای ڕاوێژکردن لە گەڵ هەر یەك لە سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتی، کەسێك ناوزەد دەکا کە ئەو لێهاتوویی و مەرجانەی تێدابێ کە بڕگە١ی ماددە١٣ی پێڕەوی ئەساسی دەستنیشانی کردوون١٠. ئەندامی هەڵبژێردراوی دادگەکە لە جیاتی ئەو ئەندامەی ماوەی خۆی تەواو نەکردووە، ماوەی دادوەری پێشەخۆی بۆ حیساب دەکرێ، دادوەرەکانی دادگە بۆ ماوەی چوار ساڵان لە جێگەی خۆیاندا دەمێننەوە و دەشێ جارێکی دی هەڵبژێردرێنەوە،

---

[9] ئەم دەقە هاوشێوەی ماددە ٩ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی دادی نێودەوڵەتییە I.C.J.

[10] لەم بڕگەیەدا هاتووە: "دەبێ دادوەران کەسانی ڕەوشت بەرز و دەست و داوێنپاك و بێ غەرەز بن و لێوەشاوەیی و کارامەیی ئەوتۆیان تێدا هەبێ کە وڵاتەکانیان وەکو مەرجی دانان لە باڵاترین پلەو پایەی دادوەریدا ڕەچاویان دەکاو لە پێکهێنانی ئەم دایرانەدا، شارەزایی دادوەران لە بواری قانوونی تاوانکاری و قانوونی نێودەوڵەتیدا بە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی و قانوونی مافەکانی مرۆڤیشەوە، بە هەند هەڵدەگیرێ".
دەست و دامێنپاکی ئاکارەکیی ئەندامانی دادگەو سەربەخۆبوون و لێوەشاوەییان هۆکاری زێدە گرنگن لە سەربەخۆبوونی دادگە لە هۆکاری سیاسی. دەقی ئەم ماددەیە لەو چەمکە نێودەوڵەتییە پێویستانەیە بۆ هەر سازدانێکی دادوەریی نێودەوڵەتی.
هەروا بگەڕێوە بۆ: ماددە ٢ی پێڕەوی ئەساسیی I.C.J و ماددە ٦ی پڕۆژەی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی هەمیشەیی.

هەمان ئەو ڕێساو مەرجانەی خزمەتکردن کە بەسەر دادوەرەکانی I.C.J دا جێبەجێ دەکرێن بەسەر ئەوانیشدا دێنە جێبەجێ کردن.

ئەنجوومەنی ئاسایش بە بڕیاری ٨٥٧ی ١٩٩٣/٨/٢٠، لیستێکی بە ناوی ٢٣ کاندید کە ڕەگەزنامەی دەوڵەتانی ئەندام لە UNیان هەبوو و کاندیدێك کە ڕەگەزنامەی دەوڵەتێکی نا ئەندام ، سویسرای هەڵگرتبوو، هەڵبژارد١١.

**٢-١-١-٢: دەستەی داواکاری گشتی**

داواکاری گشتی لە دادگەی نێودەوڵەتیدا، دەزگایەکی بە جیا هەڵکەوتووەو بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە دەزگاکانی تر کاری خۆی دەکا (بڕگەی ٢ ی مادده ١٦). دانەرانی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی، ئایدیای سیستەمی تاوانبارکردنی لە وڵاتانی ئەنگلۆ- ساکسۆنی خواستووەتەوە کە دادگەی نۆرمبێرگیش کاری پێدەکردو جیاوازییەکی زۆری لە گەڵ سیستەمی لێوەکۆڵین ( لە سیستەمی ئەورووپاییدا باوە) هەیە. داواکاری گشتی لە سیستەمی تاوانبارکردندا، تەبای دیفاع، لایەنێکی

---

[11] ئەو دادوەرانە لە ناوەخۆیاندا بە گوێرەی بڕگە ١ی مادده ١٤ی پێڕەوی ئەساسیی، بەرێز ئەنتۆنیۆ کاسییزیان (ئیتالیا) بە سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی هەڵبژارد. سەرۆکی دادگە ئەندامیشە لە دایرەی تێهەڵچوونەوەو سەرۆکایەتی دادڕەوییەکانی دەکا (ئەم ئەرکە ئاسانە، چونکە هەڵسوڕاندنی دادخوازی بە پێی سیستەمی تاوانبارکردن، مافی دژبەرەکانە نەك دادگای نێودەوڵەتی. ئەوە داواکاری گشتی و دژبەرانن کە لە شایەتان و گومانلێکراوان دەپرسنەوە، وەلێ سەرۆکی دادگە خۆی سەرپەرشتی سیستەمەکەو باش بەرێوەچوونی دادگە، دەکات"، سەرۆکی دادگە دوای پرس وراکردن بە دادوەرەکان، دادوەران بەسەر هەردوو دایرەی دادگاییکردن دا بەش دەکات و سکرتێری گشتیی UN پرس بە سەرۆکی دادگە دەکا بۆ دامەزراندنی تۆمارکاری دادگە. بە پێی مادده ٣٤ی پێڕەوی ئەساسی، سەرۆکی دادگە بەرپرسە لە پێشکەشکردنی راپۆرتی ساڵانە لە بارەی دادگەی نێودەوڵەتی و کارو چالاکییەکانی بۆ بەردەم ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتی.

دادوەرانی دادگە تەنیا لەو دایرەی کە ئەرکیان پێ سپێردراوە کار دەکەن، دادوەرانی هەر دایرەکیش لە نێوەخۆیاندا سەرۆکێك بۆ بەڕێوەبردنی دادڕەوییەکانی دایرەکە هەڵدەبژێرن.

دادوەرانی ئێستای دادگەی نێودەوڵەتی دەوڵەتنامەی ئەو وڵاتانەیان هەیە: میسر، ئوسترالیا، پاکستان، چین، فەرەنسا، کەنەدا، کۆستاریکا، مالیزیا، نێجیریا، ئەمریکا".

سەربەخۆیە لە لایەنەکانی داوا ( لایـەنێکی تـەواوکار نییـە) و لـە هـۆلی دادگـادا لـە بەرانبەریـدا دادەنیشـێ (نـەك لـە کەوانـەی تەنیشـت دادوەران) و داواکـاری گشـتی بەرپرسیارەتی لێکۆڵینـەوەی لـە ئەسـتۆیە لـە گـەڵ ئـەو کەسـانەی لـە پێشـێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتی مرۆیی بەرپرسن کە لـە یۆگۆسـلافیای جـاران لـە ١٩٩١/١/١ەوە ئەنجامدراون، دەزگایـەکی لێوەکـۆڵینی تایبـەت نییـە و ئـەوە ئـەرکی داواکاری گشتییە، داوا دژی تۆمەتپێکراوان قەید بکا (بڕگە ١ی مـاددە ١٦). دەزگـای داواکاریی گشتی لە ئۆفیسی داواکاری گشتی و چەند کارمەنـدێکی لێهـاتووی تایبـەت بەو کارە پێکدێت[١٢].

داواکاری گشتی لە ڕێگەی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە دوای ناوزەدکردنی لە لایان سکرتێری گشتییەوە[١٣] دەستنیشان دەکرێ و دەبێ ئەو کەسە خودان ئاکارێکی بالاَ بێ و دەستدان و شارەزاییەکی باشی لە لێوەکۆڵین و دادگاییکردنی کێشە تاوانکارییەکاندا هەبێ.

داواکاری گشتی بۆ ماوەی چوار ساڵان کـە دەکـرێ نوێبکرێتـەوە، کـاری خـۆی دەکـاو مەرجەکانی ڕاژەی گشتیی تایبەت بە سکرتێری گشتیی UN ی بەسەردا جێبەجێ دەبـێ

---

[١٢] دەزگای داواکاریی گشتی دەبتە چوار بـەش: ئۆفیسـی داواکـاریی گشـتی، بەشـی لێوەکـۆڵین، بەشـی ڕاژەی قانوونی، بەشی زانیاری و تۆمارکردن.

I.C.T.Y, Bulletion, op, cit, No.4, 15-3-1996, p.3.

[١٣] چەندین ڕەخنە ئاڕاستەی شێوازی دانانی داواکاری گشتی لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە کراوە کە چاکتر بوو بە هەمان شێوازی دانانی دادوەرانی دادگەکە بوایە (لە ترسی ئەوەی نەبادا سەربەخۆیی داواکاریی گشتی لەکەدار ببێ). ئەو ڕەخنەیەش هەیە کە داواکاری گشتی بە تەنیا ڕاسپێردراوە بە ئەرکی لێوەکۆڵین و وەدواکەوتنی گومانلێکراوان، بە پێشنیاری هەندێك دەبوایە دەزگایەکی تایبەتی لێوەکۆڵین، یان دەستەیەکی چەند کەسی بۆ ڕاپەراندنی ئەم ئەرکە هەبوایە.

Pellet, op, cit, pp. 44-45.

(بڕگە٤ی مادده ١٦)١٤، هەرچی کارمەندانی ئۆفیسی داواکاری گشتین ئەوا لـە لایـەن سکرتێری گشتیی UN ەوە پاش راسـپاردەی داواکـاری گشـتی (بڕگـە ٥ی مـادده ١٦) ناوزەد دەکرێن.

### ٣-١-١-٣: قەڵەمی دادگە:

قەڵەمی دادگـە دەورێکـی کـەم گـرنگتری لـە دەسـتەکانی دی دادگـە لـە راپەڕانـدنی ئەرکەکاندا نییەو لە تۆمارکارو چەند کارمەندێکی دی بەپێی پێویست پێکـدێت (بڕگـە ٢ی مادده ١٧ی پێڕەوی ئەساسی). سکرتێری گشتی دوای پرس وراکـردن بـە سـەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی بۆ ماوەی چوار ساڵان تۆمارکار دادەمـەزرێنێ و دەشـێ سـەرلەنوێ دایبمەزێنێتەوە و حوکمگەل و مەرجەکانی راژەی تۆمارکـار، هـەر ئـەو مەرجانـەن کـە تایبەتن بە راژەی یاریدەدەری سکرتێری گشتیی UN (بڕگە ٣ی مادده ١٧)[١٥]. قەڵەمی دادگـە بەرپرسـە لـە کارهەڵسـوڕاندن و پێشکەشـکردنی خزمـەتگوزاری بـە دادگـەی نێودەوڵەتی. هەروا کارمەندەکانی دیکەی دادگەش بـە پێـی راسـپاردەی تۆمارکـار لـە لایەن سکرتێری گشتییەوە دادەمەزرێنرێن (بڕگە ٤ ی مادده ١٧).
قەڵەمی دادگە سروشتێکی دوولایەنەی هەیە: کاری خزمـەتگوزاریی ئیـداری و دادوەری پێشکەش بە هەموو دایرەکانی دادگەو داواکاری گشتی دەکا و چالاکییەکانی دادگە لـە

---

[١٤] بەرێز رامون ئەسکۆفار (فەنزویلا) وەکو داواکاری گشتیی دادگەی نێودەوڵەتی داندرا، وەلێ لە مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٩٤دا دەستی لە کار کێشایەوە. لە جیاتی وی، بەرێز ریچارد گۆلدستان (خوارووی ئەفریقیا) داندراو لە ١٩٩٤/٨/١٥ەوە تا ١٩٩٦/٩/٣١ لە کارەکەیدا بەردەوام بوو، لە ١٩٩٦/٢/٢٩دا ئەنجوومەنی ئاسایش بە بڕیاری ١٠٤٧ داواکارێکی گشتیی نوێی بۆ دادگەی نێودەوڵەتی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران لە ١٩٩٦/١٠/١ەوە دانا.

[١٥] تۆمارکاری ئێستای دادگەی نێودەوڵەتی بەرێز خانم دۆریتە مارگرێتە کە دەوڵەتنامەی هۆلەنـداو پورتوگـالی هەیە.

گرتوخانەی دادگە ( یەکەی گلدانەوە) بگرە تا هۆڵی دادگە، فایل و دۆسییەکانی دادگە، نامەو نامەکاری، وەرگێڕانی دۆکیومێنتەکان و تۆمارکاری رێکدەخات. هەنووکە قەڵەمی دادگە لە چەند بەشێك پێکدێت:

- بەشی خزمەتگوزاریی قانونی (Legal Support). ئەم بەشە راوێژکاریی قانونیی پێشکێش بە تۆمارکار دەکات لەمەڕ پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی و تابلۆی رێساگەلی دادڕەویی و رێساگەلی سەلماندنەوە.
- بەشی رۆژنامەگەری و زانیاری (Press and Information). ئەم بەشە خزمەتگوزاریی راگەیاندن پێشکێش دەکات.
- بەشی ئاسایش (Security): ئەم بەشە بەرپرسیارە لە پاراستنی تۆمەتپێکراوان، بەندیخانەی دادگە، پاراستنی میوانان و دۆکیومێنتەکانی دادگە.. هتد.
- بەشی خزمەتگوزاریی دادوەری (Judical Support Service): ئەم بەشە خزمەتگوزاری پێشکێش بە دادیاری داکۆکی، زیندانی دادگە، یەکەی پاراستنی شایەدو قوربانییان، هۆڵی دادگە..هتد.دەکا.
- بەشی بەرێوەبەربردن (Administrative Service): ئەم بەشەیان خزمەتگوزاری سەبارەت بە هۆیەکانی گواستنەوە، وەرگێڕان، ژمێریاریی دارایی، خزمەتگوزاری گشتی.. تاد، پێشکەش بە دادگە دەکات[١٦].

دیاهی مادده ٣٠ی پێڕەوی ئەساسی ستاتۆی دادگەی نێودەوڵەتی و ئیمتیازات و (حصانە Imunity)ەکانی دیاری دەکات. رێککەوتننامەی ١٣ی شوباتی ١٩٤٦ی تایبەت بە ئیمتیازات و (حصانە)ی نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەر دادگەی نێودەوڵەتی و دادوەرانی، داواکاری گشتی و کارمەندانی، تۆمارکارو کارمەندانی جێبەجێ دەبێ (برگە١ ی مادده ٣٠). دادوەران و داواکاری گشتی و تۆمارکاری هەمان ئەو ئیمتیازات و (حصانە) و لێخۆشبوون و ئاسانکارییەیان هەیە کە بۆ نێردە دیپلۆماتیکەکان بەپێی

[١٦] I.C.T.Y, Bulletion, op, cit, No. 2, 22-1-1996, p.2.

قانوونی نێودەوڵەتی دابین دەکرێ. هەرچی سەبارەت بە کارمەندانی داواکاری گشتی و تۆمارکاریشەوەیە، ئەوا بەپێی هەردوو ماددەی (٥،٧)ی ڕێککەوتننامەی ناوبراو، (حصانە) و ئیمتیازاتیان بۆ دەستەبەر دەکرێ. کەسانی تری وەکو ( شایەدو قوربانییان و تۆمەتپێکراوان) دەبێ لە بارەگای دادگەی نێودەوڵەتی، یان لە جێگەی دادگەییکردندا، بەپێی (بڕگە ٤ی ماددە٣٠)١٧، بەشێوەیەکی ئەوتۆ رەوتاریان لە گەڵدا بکرێ کە کارەکانی دادگەی نێودەوڵەتی بە دروستی بەرێوەبچن.

**٢-١-٢-٤: بنکەی دادگەو خەرجییەکانی :**

بارەگای دادگەی نێودەوڵەتی لە شاری لاهای هۆلەندایە (ماددە ٣١ ی پێڕەوی ئەساسی)[١٨]. هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی، زمانی فەرمی دادگەن (ماددە

---

[١٧] ڕێککەوتننامەی هەڵاوێردە (امتیازات)و (حصانات)ی UN بە گوێرەی ماددە ١٠٥ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچوو، ئەم ڕێککەوتننامەیە، لەمەڕ (حصانە)ی دادوەری و کەسایەتی و دارایی و هەندێ هەڵاوێردەی تری وەکو بەخشینی فەرمانبەرانی نێودەوڵەتی لە کۆت و بەندی کۆچکردن و بەخشین لە خزمەتی سەربازی (بە مەرجگەلی دیاریکراو) و ئاسانکاریی ڕێوشوێنەکانی سەفەرو بەخشینی تری بە مەرجە.

بەپێی بڕگە ١ی ماددە ٥ ، سکرتیری گشتی، دەستەکانی کارمەندان دەکا کە بنەماکانی ئەم ماددەیەو ماددەی پێشتر دەیانگرێتەوەو لیستێکی ناوەکانیان پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی دەکا و پاشان حکوومەتی دەوڵەتانی ئەندامی UNی لێ ئاگادار دەکرێتەوە. هەروا ناوبەناو ناوی کارمەندانی ئەم دەستانە بە حکوومەتی دەوڵەتانی ئەندام دەدرێ.

هەروا ڕێککەوتننامەی ڤێنای پەیوەندییەکانی دبلۆماسی لە ١٦ی نیسانی ١٩٦١، ڕێساگەلێکی پەسندکراوو وردودرێژی بە شێوەیەکی فرەوان تێدایە. لەمبارەوە و بۆ زیاتر ئاگادار بوون بگەڕێوە بۆ:

د. علی صادق ابو الهیف، القانون الدبلوماسی، منشأه المعارف بالاسکندریه، ١٩٨٧.

[١٨] سکرتێری گشتیی UN لە راپۆرتی خۆیدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش روونی کردەوە لە کاتێکدا مافی ئەنجوومەنە بارەگای دادگەی نێودەوڵەتی یەکلابکاتەوە، ئەوا لە دیدی سکرتێری گشتییەوە، چەندین توخم لە نێو بایەخەکانی دادپەروەریدا هەن بە پرسەکانی ئیداری و ئابووریشەوە کە دەبێ لەبەرچاو دابندرێن. سەبارەت بە دادپەروەری، ئەوا شتێکی گونجاو نییە بارەگای دادگەی نێودەوڵەتی لە هەرێمی یەکێ لە دەوڵەتەکانی یۆگۆسلافیای جاران، یان دەوڵەتێکی دراوسێ دابێ، وە لەبەر هۆکاری ئیداری و ئابووریش ئەوا باشترە بارەگای دادگەکە لە ئەورووپا بێ و نەتەوە یەکگرتووەکانیش چەند پێگەو جێیەکی گرنگی هەیە، جنێف و لاهای ئەم

٣٣)و له تەکیاندا زمـانی کرواتـی و سـربیش زمـانی نـا رەسمـیین. مـاددە ٣٢ روونـی کردۆتەوە کە خەرجی و تێچوونەکانی دادگە، خەرجیگەلی دادگـەی نێودەوڵـەتین بـەپێی ماددە ١٧ی پەیمانی UN [١٩].

---

مەرجانەیان تێدایە، سەبارەت بە رێککەوتننامەی پێویستیش بە دەوڵەتی خانەخوێ ئەوا سکرتێری گشتی پێی وایە دەبێ بارەگای دادگەکە لە لاهای بێ.

دوای پەسندکردنی راپۆرتی سکرتێری گشتی لە لایان ئەنجوومەنی ئاسایشەوە، رێککەوتنێك لە نێوان شانشینیی هۆلەندو نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە بارەگای دادگەکە لە ١٩٩٤/٧/٢٩ لە نیویۆرك مۆرکرا، لە گەڵ ئەوەشدا دادگەی نێودەوڵەتی بۆی هەیە لە هەر جێگەیەکی دی کە بە پێویستی بزانێ، کۆ ببێتەوە بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی بە شێوەیەکی لێزانانە (بڕگە ٦، لە بڕیاری ٨٢٧ی ئەنجوومەنی ئاسایش). بە پێچەوانەی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران، ئەوا پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا بارەگای دادگەکەی دیاری نەکردووە، بە لکە دواتر ئەنجوومەنی ئاسایش بە بڕیاری ٩٧٧ ی ١٩٩٥/٢/٢٢ بارەگاکەی دیاری کردووەو شاری ئەرۆشای پایتەختی تەنزانیای فیدرالی کردووە بە بنکەی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا.

نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ سکرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، بڕگەی ١٣١.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٥٠، ١٩٩٥.

[١٩] خەرجی دادگەی نێودەوڵەتیی لە چوار ساڵدا بە دۆلاری ئەمریکی بەم شێوەیە بووە:

٢٧٦/٢٠٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٩٣.

١/٨٠٠/٠٠٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٩٤.

٢٨/٣٠٠/٠٠٠ دۆلار لە ساڵی ١٩٩٥.

٣٥/٤٣٠/٦٢٢ دۆلار لە ساڵی ١٩٩٦.

چەندین دەوڵەت چ بە شت و چ بە پارە بەشداریی بودجەی دادگەی نێودەوڵەتییان کردووە.

بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە بۆ:

I.C.T.Y, Bulletin, op, cit, No. 4, p.4.

### ٢-١-٢: دادپەوەیی لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا

پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەولەتی، پرەنسیپە بنچینەییەکانی کارڕایی پەیوەست بە دادگاییکردنیان بەخۆوە گرتووەو تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی و ڕێساگەلی سەلماندن کە دادوەرانی دادگە پەسندیان کردوون، وردەکاریی وایان تێدایە، ڕەوتی دادگە تەواو دەکەن[٢٠].

لە ماددە ١٥ی پێڕەوی ئەساسیدا هاتووە (لەبەر ئەو دادخوازیانەی دەخرێنە بەردەم دادگەوە، دادوەرانی دادگەی نێودەولەتی، تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی و ڕێساگەلی سەلماندن دادەنێن کە لە کارڕاییەکانی دادخوازی لە قۆناخی بەر لە دادگاییکردن و لە کاتی دادگاییکردن و دادخوازییەکانی تێهەڵچوونەوە و پەسندکردنی بەڵگەو پاراستنی تاوانلێکراو و شایەدان و پرسگەلێکی تر پێکدێ)[٢١]. هەڵبەت نابێ ئەم بنەمایانە لە گەڵ پێڕەوی ئەساسیدا دژ بوەستنەوە، چونکە پێڕەوی ئەساسیی دادگە هەموو ئەو بنەمایانەی تێدا نییە کە سیستەمی قانوونیی دادگەی نێودەولەتی بەو مانایەی کە خرایە روو پێکدێنن. وێڕای ئەوەش، بێگومان پێڕەوی ئەساسی بە بناخەی سیستەمی قانوونیی دادگە بەئەژمار دێت، لەبەرئەوە دادوەرانی دادگە کە بنەمای قانوونیانەی ئەوتۆ پەسند دەکەن لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەدا ئاماژەیان بۆ نەکراوە، ئەوا دەبێ ئیلهام لە رۆحی پێڕەوی ئەساسی وەربگرن، بە مەرجێ ئەم کارڕاییانە هەروەکو لە بڕگەی (١)ی ماددە ٢٠ی پێڕەوی ئەساسیدا هاتوون (هەردوو دایرەی دادگاییکردن دەستەبەری

---

[٢٠] تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی و ڕێساگەلی سەلماندن کە دادوەرانی دادگەکە لە ١٩٩٤/٢/١١دا پەسندیان کردوون، سەرچاوەی پێشوو.

[٢١] سکرتێری گشتی بە پێی برگە ٣ی بڕیاری ٨٢٧، هەر پێشنیارێك کە لە لایەن دەوڵەتانەوە پێی بگات، سەبارەت بە تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی و ڕێساگەلی سەلماندن کە لە ماددە ١٥ی نیزامی ئەساسیدا ناوی هاتووە، بە دادوەرانی دادگەکە دەدا.

دادگـاییکردنێکی دادپەروەرانــەو خێــرا بکــەن) ببنــە دەســتەبەری دادگــاییکردنێکی دادپەروەرانەو خێرا.

### ٢-١-٢-١: دادرەویی

داواکاری گشتی بە گوێرەی پایەو پێگەی خۆی، یان بە پێی ئەو زانیارییانەی لە هەر سەرچاوەیەکدا بە دەستی کەوتوون ( بە تایبەتی لە حکوومەتان و دەزگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و سازمانگەلە نێودەوڵەتییە حکوومییەکان و سازمانگەلە نا حکوومەتییەکان)، دەست بە دادرەویی لێوەکۆڵین دەکا (برگەی ١ی ماددە ١٨ی پێڕەوی ئەساسی)٢٢. ئەوە ئەرك وکاری داواکاری گشتیە کە چۆن ئەو زانیارییانەی وەدەستی کەوتوون دەنرخێنێ، داخوا بە کەڵکی ئەوە دێن وەکو بناخەی دەستکردن بە دادرەویی، پشتیان پێبەسترێ، لەم پێناوەدا، داواکاری گشتی دەسەڵاتی لێپرسینەوەی گومانلێکراو و تاوانلێکراوان (قوربانیان) و شایەتان و کۆکردنەوەی بەڵگەو لێوەکۆڵین لە شوێنی رووداوی هەیە. داواکاری گشتی دەکارێ لە بە جێگەیاندنی ئەم ئەرکانەدا داوای هاوکاری لە دامودەزگاکانی دەوڵەتی پێوەنددار بەو شێوەیەی کە گونجاوو لەبارە، بکا (برگەی ٢ی ماددە ١٨ی پێڕەوی ئەساسی). هەروا مافی گومانلێکراویشە، هانا بۆ دادیارێك ببا کە خۆی هەڵیدەبژێرێت. ئەگەر لە بارێکدا تۆمەتپێکراو توانای دابینکردنی خەرجیی دادیاری داکۆکی لە خۆکردنی نەبێ، ئەوا دەبێ کۆمەکی قانوونی پێ بکرێ و

---

[٢٢] داواکاری گشتی، چەند راپۆرتێکی لە لایەن دەوڵەتانێکەوە پێگەیشتووە: لەوانە بۆسنیاو هەرسك و کرواتیاو پاکستان و ئیران و لە رێکخراوەکانی UN یش لیژنەی مافەکانی مرۆڤ و کۆمیسیۆنی باڵای پەنابەران و چەندین رێکخراوی نا حکوومی NGO وەکو رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی و لیژنەی پارێزەرانی مافی مرۆڤ و .. هی تر.

بەو زمانەی قسەی پێدەکاو لێی حاڵی دەبێ، تەرجەمەی بۆ بکرێ. ئەمانە پاژێکی ئەو گەرەنتییە دادوەریانەن کە گومانلێکراو مفایان لێدەبینیٚ[٢٣].

دیــارە بەدرێــژایی دادگــاییکردن، زانیــاری بــە دادگــە دەدرێ، چــونکە لــە سیســتەمی تاوانبارکردندا کە پێڕەوی ئەساســی ICTY پەســندی کــردووە، لێوەکــۆڵینی ســەرەتایی نییە. ئەمە کاری تایبەتی دادیاری داکۆکی و داواکاری گشتیە.

بڕگەی ٤ی ماددە ١٨ روونی کردووەتــەوە (ئەگــەر بڕیــار درا کــە بــەجیٚوڕێی کێشــەکە خویایە، ئەوا داواکاری گشتی سکاڵای تۆمەتبارکردن ئامادە دەکا کە زانیاری وردی لــە بارەی پێشهاتەکان و تاوانەکە، یان ئەو تاوانانەی کــە ئاڕاســتەی تۆمــەتپێکراو کــراون، تێدایە بە گوێرەی ئەم پێڕەوی ئەساسییەو سکاڵای تاوانبارکردنەکەش حەواڵەی دادوەرێك لە دادوەرەکانی دایرەی دادگاییکردن دەکرێ).

دوای ئەمە، دادوەری دایرەی دادگــاییکردن بــە ســکاڵای دادخوازییەکــە دادەچــێتەوە و ئەگەر بڕوای بەو بڕیارەی داواکاری گشتی هێنا کە بــەجیٚوڕێی کێشــەکە خویایــە، ئــەوا سکاڵای تاوانبارکردن بە هەند وەردەگیرێ، خۆ ئەگەریش دادوەر بڕوای بەمە نەکرد، ئەوا سکاڵای تۆمەتبارکردنەکە رەتدەکرێتەوە (بڕگە ١ی ماددە ١٩). داواکاری گشتی مــافی

---

[٢٣] هەروەکو پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، وەکو ئەرك لە ئەستۆی قەڵەمی دادگەیە، ئەگەر تۆمەتپێکراو نەشیا دادیارێکی داکۆکی بۆ خۆی دابنیٚ، دادیارێکی بۆ دابنیٚ و وەرگێرکیشی بەو زمانە کە گومانلێکراو تێی دەگاو قسەی پێدەکا، بۆ پەیدا بکا. بە پشتبەستن بە رێساکانی ٤٢ و ٤٥ و ٥٥ لە تابلۆی رێساگەلی دادڕەویی و رێساگەلی سەلماندن و بە لەبەرچاوگرتنی رێکەوتننامەی مۆرکراو لە بارەی بارەگای دادگەکەو ئەو رێساو بنەمایانەی کە پەیوەستن بە زیندانی دادگەکە کە دادوەرەکانی دادگە لە ١٩٩٤/٥/٥دا پەسندیان کردووە، ئەوا پەیرەوی ناوەخۆ (رێنوێنی ئیداری) د\اندراوە سەبارەت بە دادیاری داکۆکی لە ١٩٩٤/٧/٢٨ بە بڕیاری ژمارە (١/٩٤) و پاشان لە ١٩٩٦/٦/٢٥دا هەموار کرا. ئەم رێنوێنیانە کاروبارەکانی دادیاری داکۆکی رێکدەخەن لەوانە: دامەزراندنیان، مافەکانیان، ئەرکەکانیان، مەسەلەکانی دارایی، دەس لەکار کێشانەوەو ..تاد.

I.C.T.Y, Directive on Assignment of Defence counsel, directive No. 1/94, as amended, 25 June 1996.

ئەوەی نییە، فەرمانی گرتن بۆ تۆمەتپێکراوان دەربکا، بەڵکە ئەمە ئـەرکی دادوەرە لـە دایرەی دادگاییکردن، ئەگەر دادوەر باوەڕی بە سکاڵای تۆمەتبارکردن هێنا، ئـەو دەمـە دەکارێ لەسەر داوای دادخواز (فەرمان، یان دەسەڵاتپێدانی فەرمی بـۆ گرتنـی کەسـان، یان گلدانەوەیان، یان تەحویلدانەوەیان، یان هەناردنیان ، یان هـەر فـەرمانێکی دی کـە پێوەندیی بە رەوتی دادگاییکردنەوە هەیە) دەربکا، (بڕگەی ٢ی ماددە ١٩).

ماددە ٢٠ی پێڕەوی ئەساسی، بە تێری لە دادڕەویی و رەوتی دادگاییکردن دواوە، ئەمـە وێڕای کە دەبێ دادگاییکردن دادپەروەرانەو خێرا بـێ و بـە گـوێرەی تـابلۆی رێسـاگەلی دادڕەویـی و رێسـاگەلی سـەلماندن بچـتە پێشـەوە و بـە تـەواوی رێـز لـە مافـەکانی تۆمەتپێکراو بگیرێ و بایەخی پێویست بە پاراستنی تاوانلێکراوو شایەتان بدرێ[٢٤].

[٢٤] ئەوەی تێبینی دەکرێ و سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە ماددە ٢٢ تەرخانکراوە بۆ پاراستنی تاوانلێکراوان (قوربانییەکان) و شایەتان وەکو دووبارەکردنەوەیەکی ئەم ماددەیە، دادگەکەی پابەند کردووە کە (دادگەی نێودەوڵەتی لە تابلۆی رێساگەلی دادڕەویی و رێساگەلی سەلماندنی تایبەت بە خۆی باس لە پاراستنی تاوانلێکراو و شایەتان بکا و ئەم پاراستنە بۆ نموونە نەك دەقاودەق و بە تەنێ، گرێدانی دانیشتنی داخراوو پاراستنی پێناسەی تاوانلێکراوان، دەگرێتەوە).

بەکردەوە رێساکانی ٦٩ و ٧٥ و ٧٩ لە تابلۆی رێساکانی دادڕەویی و رێساکانی سەلماندن باس لەم پاراستنەو کارڕاییەکانی پەیوەست دەکا کە قەڵەمی دادگە دابینیان دەکا، لەوانە پاراستنی پێناسەی تاوانلێکراوان و گۆڕینی دەنگ و وێنە و ئەوەی پێی دەگوترێ Vido-Link وCamera proceeding و پێویستی بە بڕیاردانی پاراستنی شایەدان بە وەرگرتنی بڕیارێك لە دادگەکەوە هەیە و گوێگرتن لەو بەیاناتانەی لە لایەن داکۆکی، یان داواکاری گشتییەوە پێشکەش دەکرێن و دەرفەتدان بە هەردووکیان کە وەلامی یەکدی بدەنەوە و دادگە بۆی هەیە پرس وڕا بە یەکەی پاراستنی قوربانییان و شایەتان لە قەڵەمی دادگەکە بکا بەپێی رێسای ٣٤ لە تابلۆی رێساکانی دادڕەویی و رێساکانی سەلماندن.

نموونەی ئەمەش، بڕیاری دایرەی یەکەمی دادگەیە بۆ پاراستنی شایەدەکانی X و Y لە کێشەی Drazen Frdemovic:

I.C.T.Y, Orders for Measure of Protection for Witness X and for Witness Y, Trail, Chamber I, Case No: IT-96-22-T, 13 Nov 1996.

هەوەڵجار وا دێتە بەرچاو کە پرەنسیپی پاراستنی شایەدان و تاوانلێکراوان لە گەڵ پێڕەوی ئەساسیدا دژو ناکۆکە. ئەگەر هەقت دەوێ دەبێ دادگاییکردن دادپەروەرانەو بە ئاشکرا بێ (برگەی ٢ی مادده ٢١)، هەروا کاتی پێویست بە تۆمەتپێکراو بدرێ و ئاسانکاری بۆ بکرێ تا داکۆکینامەی خۆی ئامادە بکاو لە گەڵ ئەو دادیارەی خۆی دەستنیشانی دەکا، قسان بکا ( ج، برگەی ٤ی مادده٢١) و رووبەروو دادگایی بکرێ و بەرگری لە خۆی بکا (د، برگەی ٤ی مادده ٢١)و لە شایەدەکانی سەلماندن بپرسێتەوە، یان داوای لێپرسینەوەیان لە گەڵدا بکات و ئامادەبوونی شایەتەکانی نەکردنی بۆ دەستەبەر بکرێ و بە هەمان مەرجی پێوەندار بە شایەتەکانی سەلماندن لێپرسینەوەیان لە تەکدا بکرێ (هە، برگەی ٤ی مادده ٢١ی پێڕەوی ئەساسی)٢٥. سکرتێری گشتی لە

---

پرۆژەی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی هەمیشەیی بە دەق باسی لەم پاراستنە لە مادده ٤٣ کردووە: (دادگە رێوشوێنی پێویست و شیاو بۆ پاراستنی تاوانلێکراوان و شایەتەکان پەیرەودەکا و دەشێ بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە، دانیشتنی نهێنیش گرێ بدا، یان بە هۆی دەستاوێژی ئیلیکترۆنی و دەستاوێژی تایبەتی تر بەڵگە پێشکەش بکرێ).

[٢٥] هەروەکو دادیاری داکۆکی روونی کردەوە، پرەنسیپی بە ئاشکرا دادگاییکردن لە هەندێ دەستووردا، لەو کارانەیە کە ناکرێ بروشێندرێ مەگەر بۆ پێداویستیەکانی دادپەروەری وەکو مادده ١٨٢ی دەستووری یۆگۆسلافی و مادده ٥٧ی دەستووری هەنگاری و مادده ٣٩ی دەستووری کۆستاریکا. لە لێکۆڵینەوەیەکی تازەی پرۆفیسۆر محمود شریف بسیۆنی دەرکەوتووە کە نزیکەی ٣٩ دەستوور لە دەستووری دەوڵەتان ئەم مافە، یان ماددەی هاوشێوەی ئەمەیان تێدایە.

M. Sherif Bassouni, Human Right in the context of criminal justice, Identyfing International Procedural Protections and Equivalent protection in National Constitution, Duke Journal of Comparative and International Law, Vol. 3, 1993, p. 235.

وەلێ ئەم مادده ٢٢ —ە مافی گومانلێکراو پێشێل ناکات، لە کتیبێکی نوێ لە مەڕ دادڕاییەکانی بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا هاتووە.

The Protection Measure can not inginqe the rights of the accused.

واتە کارڕاییەکانی پاراستن ناشێ مافەکانی گومانلێکراو پیشێل بکەن.

راپۆرتی خۆیدا پرسی پاراستنی شایەتان، ئەمازە قوربانییانی بە گرنگ داناوە بە تایبەتی لە کێشەو دۆزی بە نموونە وەکو تۆبزیگێکردن و دەستدرێژیی سێکسی، کەواتە بوونی ئەم پاراستنە لە بەر رۆشنایی ئەو فاکتە تایبەتییانەی پێوەندییان بە سروشتی تاوانگەلە ئەنجامدراوەکان لە یۆگۆسلافیای جاراندا هەیە، پێویستە٢٦.

هەر کاتێ تۆمەت ئاراستەی تۆمەتپێکراوێك بکرێ، دەبێ تۆمەتپێکراو بگیرێ و گلبدرێتەوە Seizure و ئەو دەمە دایرەی دادگاییکردن، مۆڵەتێك بۆ دادگاییکردنی دادەنێ پاش ئەوەی دڵنیا دەبێ کە مافەکانی تۆمەتپێکراو جێگەی رێزگرتنن و سکاڵای تۆمەتدانە پاڵی بەو زمانە بۆ خوێندرابێتەوە کە تێیدەگات و داوای وەڵامدانەوەی لێ

---

Virgini Morris & Micheal P. Scharf, An Insiders guide to the International Criminal Tribunal for Former Yugoslavia, Transational Publishers, Inc: Irvington, on Husdson, New York, Vol, 1, 1995, p. 244.

ئەو مەرجانەی کە دەبێ لە بەردەم دادگەدا بڕەخسێندرێ تا ددان بە بەرنامەی پاراستنی شایەت دابنێ و پەسند بکا:

- ئەگەر ئامادەبوونی شایەت پێویست بە رێوشوێنەکانی پاراستن بکا.
- ئەگەر ترسێکی راستەقینە لەسەر ساغ و سەلامەتی شایەت، یان یەکێ لە خێزانەکەی هەبێ.
- ئەگەر دادگە ئەو بڕوایەی هەبێ کە هیچ بەڵگەیەك نییە "حوکمی رووبەروو" لە کێشەکەدا هەبێ کە بتوانێ شایەدیی شایەت دوور بخاتەوە.
- ئەگەر شایەتدان گرنگ بوو لە هێنانە ئارای کێشەی داواکاری گشتیدا.

کەواتە کارڕاییەکانی پاراستنی شایەتان هیچ ناکۆکییەکی لە گەڵ پێڕەوی ئەساسیی داددگەی نێودەوڵەتیدا نییە بە تایبەتی هەندێ لە شایەتەکانی داکۆکی سوودیان لەم پاراستنە وەرگرتووە. ئەم پاراستنە بە گوێرەی میکانیزمێکە کە لە لایەن دادگەی نێودەوڵەتی خۆیەوە دەپشکندرێ و بە پێی قەناعەتی خۆیان بڕیار دەدەن کە داخوا رێوشوێنەکانی پاراستن پێویستن یان نا.

[٢٦] نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سکرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، بڕگەی ١٠٦

بخوازرێ (برگە ٣ی ماددە ٢٠)، دانیشتنەکانی دادگا بە ئاشکرا بە ڕێوەدەچن، مەگەر دایرەی دادگاییکردن خۆی بڕیار بدا کە دانیشتەکان بە نهێنی و لە ژووری داخراودا بە گوێرەی تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەویی بکرێن[٢٧].دایرەی دادگاییکردن دەشێ سەیری ئەو

---

[٢٧] مافەکانی تاوانبارکراو جێگەی ریزگرتن و پێزانینن دەستەواژەیەکە ماددەی ٢١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی دەگرتەوە کە پێوەندیی بە مافە بنچینەییەکانی گومانلێکراوەوە هەیە: ئەویش ئەو ڕێوشوێنانەن کە سەرچاوەیان لە دۆکیومێنتە نێودەوڵەتییەکانەوەیە وەکو پەیمانی ئەورووپی و پەیمانی ئەمریکی و بەشێوەیەکی بنچینەیش لە هەردوو ماددەی (١٤، ١٥)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا ئەم مافانە جێگیرکراون لە گەڵ ڕەچاوکردنی داڕشتندا کە لە گەڵ پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیدا بگونجێ. مافەکانی گومانلێکراو کە لە نیزامی ئەساسیدا هەن، ئەمانەن:

١- هەموو لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا وەکو یەکن . ئەمە هاوشێوەی (برگە١ی ماددە ١٤)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکانە.

٢- لە کاتی تۆمەتدانەپاڵ گومانلێکراودا، دەبێ گوێ لە قسەکانی گومانلێکراو بگیرێ بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان و بەئاشکرا بە گوێرەی ماددە ٢٢ی پێڕەوی ئەساسیی.. ئەمە هاوشێوەی (برگە ١ی ماددە ١٤)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکانە

٣- گومانلێکراو تا ئەو دەمەی تاوانەکەی لەسەر ساغ دەبێتەوە بەبێ گوناه دادەنرێ. ئەمە هاوشێوەی (برگە٢ی ماددە١٤)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکانە.

٤- لە کاتی تۆمەتدانە پاڵ گومانلێکراودا، بە پێی ئەم نیزامە، ئەوە مافی گومانلێکراوە لەسەر بنەمای وەکیەکی، بەلانی کەمەوە ئەم گەرەنتیانەی خوارەوەی بۆ دەستەبەر بکرێ. (بە برگەو ریزبەندییەکانییەوە بە برگەی ٣ی ماددە ١٤)ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان دەچێ.

I- هەم زوو بەزوو هەم بە درێژی بەو زمانەی کە گومانلێکراو لێی حاڵی دەبێ، لە سروشت و هۆی ئەو تۆمەتەی ئاراستەی کراوە ئاگادار بکرێتەوە.

II- دەبێ هەم کاتی پێویست و هەم ئاسانکاری بۆ بڕەخسێندرێ تا داکۆکینامە لە خۆکردن ئامادە بکاو قسە لە گەڵ ئەو دادیارەی خۆی دیاری دەکا، بکا.

III- دەبێ بەبێ وەدرەنگداخستنی بێ جێ و بێ پاساو، دادگایی بکرێ.

IV- ڕووبەڕوو دادگایی بکرێ، داکۆکی لە خۆی بکا، یان لە ڕێگەی یارمەتیی قانوونیانەوە کە خۆی دەستنیشانی دەکا و دەبێ لە مافی خۆی سەبارەت بە یارمەتیی قانوونیانە ئاگادار بکرێتەوە ئەگەر ئەم یارمەتییەی بۆ نەرەخسێندراو لە هەموو بارێکدا کە بەرژەوەندی دادپەروەری وا پێویست دەکا دەبێ یارمەتیی

تۆمەتانە بکا کە ئاراستەی زێتر لە یەك تۆمەتپێکراو کراون لە یەك کاتدا لە گەڵ ڕەخساندنی بوار بۆ تۆمەتپێکراو کە نارەزایی خۆی بە پشتبەستن بە هۆکاری تەواو، لە سەر ئەو بەیەکەوە کۆکردنەوەیە، دەربڕێ[28].

**٢-١-٢-٢: بڕیارەکانی دادگەو جێبەجێکردنیان**

دایرەی دادگاییکردن، حوکمی ئەو کەسانە دەدا کە بە ئەنجامدانی پێشێلکاریی زلی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی تاوانبارکراون (بڕگەی ١ی ماددە ٢٣ی پێڕەوی ئەساسی). بڕیاریش بە زۆرینەی دەنگی دادوەرانی دایرەی دادگایی و بە ئاشکراش دەدرێ. لەبارێکدا ئەگەر دادوەرێك رایەکی سەربەخۆ، یان پێچەوانە هەبێ، ئەوا دەشێ لە پەراوێزی بڕیاری حوکمدا یاداشت بکرێ (بڕگەی ٢ی ماددە ٢٣)٢٩. ، هەر چەندە قانوونگەلی یۆگۆسلافیای جاران باس لە سزای سێدارەدان دەکەن، وەلێ بە گوێرەی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران ، دادگە سزای لە سێدارەدانی لە نێو سزایەکانی خۆی، لا بردووە٣٠.

---

قانوونیانەی بۆ دابین بکرێ بەبێ ئەوەی گومانلێکراو هیچ خەرجییەکی بکەوێتە ئەستۆوە ئەگەر هاتوو پارەو پوولێکی وای نەبێ کە ئەم خەرجییەی پێ بدا.

V- لە شایەتەکانی سەلماندن بپرسێتەوە، یان داوای لێ پرسینەوەیان لە گەڵدا بکا.

بڕگەکانی دیکەی ماددە ١٤ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتی کتو مت وەکو ماددەکانی ٢٤ و ٢٥ و ٢٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتین.

[28] بگەڕێوە بۆ رێساکانی ٨، ٧٣، ٨٢ لە رێساگەلی کارڕایی و رێساگەلی سەلماندن، سەرچاوەی پێشوو.

[29] ئەگەر دادوەر لە گەڵ دەقی بڕیارەکە بوو، بەلاّم دژی هۆیەکانی بوو ئەوا بەو رایە دەگوترێ، رای تاکەکەسی. خۆ ئەگەر دادوەر هەم دژی دەقی بڕیارەکەو هەم دژی هۆیەکانی بوو، ئەوا بەو رایە دەگوترێ دژەڕا.

[30] Phillipe Weckel, Linstitution dun tribunal international pour la repression des crimes de driot humanitaire en Yougoslavie, A.F.D.I. 1993, p.254.

کاتێ کە دادگەی نێودەوڵەتی، تەماشای ئەو سزایەی بۆ کەسێکی بڕیوەتەوە دەکا، کە بە یەکێ لەو تاوانانەی لەم پەیڕەوی ئەساسییەدا هاتووە، تاوانبارکراوە، ئەو ماوەیەی بۆ حسێب دەکا کە دادگەی نیشتمانی لەو سزایەی بۆ هەمان کەس و بۆ هەمان کاری بڕیوەتەوە، ڕۆیوە (بڕگەی ٣ی ماددە ١٠). ئەو سزایانە دیاریکراون کە دادگەی نێودەوڵەتی بۆ زیندانیکراویان دەبڕێتەوە و سزای زیندانیکردنیش بە گوێرەی بڕیارەکانی زیندانیکردنە کە دادگەگەلی یۆگۆسلافیای جاران دەریان دەکا، دایرەی دادگاییکردن لە کاتی دەرکردنی هەر بڕیارێکدا، هۆکاری لەبابەت: زلی و قەبەیی تاوان و هەلومەرجی کەسایەتیی بڕیاربەسەردراو ڕەچاو دەکا ( بڕگەی ٢ی ماددە ٢٤)، دادگە بۆی هەیە فەرمان دەربکات هەر ماڵ و موڵکێکی زەوتکراو بە خاوەنە شەرعییەکەی بدرێتەوە کە بەهۆی ڕەوتاری تاوانکارانە بە زۆرلێکردنیشەوە، دەستیان بەسەرداگیراوە ( بڕگەی ٣ی ماددە ٢٤). پێڕەوی ئەساسیی داگەی نێودەوڵەتیی ڕێگەی بە تێهەڵچوونەوەو چاوگێڕانەوە بە بڕیاری دادگا داوە بە مەرجێ تێهەڵچوونەوە دەکرێ، ئەگەر هەڵەیەك لە پرسێکی قانوونی، یان هەڵەیەك لە پێشهاتەکاندا هەبووبێ کە نادادپەروەرییان لێبکەوێتەوە (بڕگەی ١ی ماددە ٢٥). هەرچی چاوخشاندنەوەیە بە بڕیاری حوکم ئەو کاتە دەبێ ئەگەر (پێشهاتێکی تازە بێتە گۆڕێ کە لەمەوبەر و لە کاتی تێڕوانینی دادخوازی لە بەردەم دایرەی دادگاییکردندا، یان دایرەی تێهەڵچوونەوەدا نەزانراوە و دەکرێ ببتە هۆکارێکی یەکلاکەرەوە لە گەیشتن بە بڕیار) (ماددە ٢٦). ماوەی زیندانی لە هەر دەوڵەتێکدا بەسەر دەبردرێ کە دادگەی نێودەوڵەتی لە ناو لیستی ئەو دەوڵەتانەی ئامادەگی خۆیان بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش دەربڕیوە سەبارەت بە پێشوازیکردنی مەحکومکراوان، دیاری دەکا و زیندانیکردنیش بە پێی قانوونی کارپێکراوی دەوڵەتی خانەخوێ و لەژێر چاوەدێریی دادگەی نێودەوڵەتی دا دەبێ (ماددە

---

ئەم ماددەیە ڕێکە لە گەڵ پرۆتۆکۆلی دووەمی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان کە دەوڵەتان پابەند دەکا هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ هەڵوەشاندنەوەی سزای لەسێدارەدان وەربگرن.

٢٧)[٣١]، به لێبووردن و سووككردنی حوكمیشەوە، بە مەرجێ ئەو دەوڵەتانەی كە مەحكومكراو لە یەكێ لە زیندانەكانیاندا ماوەی زیندانی بەسەر دەبا، بە گوێرەی ماددە ٢٨ی پێڕەوی ئەساسی پابەند بن بە ئاگاداركردنەوەی دادگەی نێودەوڵەتی لە حاڵەتی لێبووردن، یان سووككردنی حوكم، چونكە نە لێبووردن و نە سووككردنی حوكمی دادگە، جێگەی خۆیان ناگرن ئەگەر سەرۆكی دادگە بە راوێژكردن لە گەڵ دادوەرانی دادگەو

---

[٣١] سكرتێری گشتی لە راپۆرتی پێشكەشكراوی خۆیدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش دەڵێ: دەبێ جێبەجێكردنی سزاكان لە دەرەوەی زیندانەكانی هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا بن لەبەر سروشتی ئەو تاوانانەی بڕیاریان لەبارەوە دراوە و لەبەر سیفەتی دادگەی نێودەوڵەتی. هەروا دەبێ دەوڵەتان هان بدرێن كە پێشوازی لە مەحكومكراوان بكەن.

نەتەوە یەكگرتووەكان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سكرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، بڕگە ١٢١.

چەند دەوڵەتێك ئامادەبوونی خۆیان نیشان نەدا كە مەحكومكراوان وەربگرن وەكو: فەرەنسا، مالیزیا، پۆلندا، سلۆڤینیا، ئەكوادۆر.. تاد. تەنیا ١٢ دەوڵەت ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە كە لە زیندانەكانیاندا سزاكان جیبەجێ بكرێن. هەندێ لەو دەوڵەتانە بە خۆگرییەوە ئامادەگی خۆیان نیشانداوە:

ئەو دەوڵەتانەی كە ئامادەبوونی خۆیان بەبێ خۆگری نیشانداوە ئەمانەن: بۆسنیاو هەرسك، كرواتیا، ئێران، فلندا، ئیتالیا، نەرویج، پاكستان. ئەو دەوڵەتانەش كە بە خۆگرییەوە ئامادەبوون ئەمانەن: دانیمارك و ئەڵمانیا و هۆلەنداو ئیسپانیاو سوید. بۆ نمونە، هۆلەندا روونی كردەوە كە ئەو یەكەمین دەوڵەت نابێ كە مەحكومكراوان لە زیندانەكانی خۆیدا وەربگرێ. كەچی سویدو ئەڵمانیا تەنیا ئەو مەحكومكراوانە وەردەگرن كە پێوەندیەكیان بەوانەوە هەیە. ئێستا چەندین دەوڵەت چاوەڕوانی دەرچوونی رەزامەندی وەرگرتنی مەحكومكراوان دەكەن. بەكردەوە دادگەی نێودەوڵەتی یەكەمین رێككەوتنی لە گەڵ ئیتالیادا لە ١٩٩٧/٢/٦دا مۆركرد بۆ جێبەجێكردنی سزاكان لە زیندانەكانی ئیتالیادا.

لە ١٩٩٦/١١/٢٩دا لە كێشەی Drazen Erdemovic دایرەی یەكەمی دادگاییكردن لە یەكەمین بڕیاردا ، ١٠ ساڵ زیندانی بۆ تاوانباری ناوبراو، بڕیەوە.

I.C.T.Y, Bulletin, op, cit, the penalties at the I.C.T.Y, Supp. No. 1, No/12, 15-11-1996.

I.C.T.Y, Sentencing Judgment, Trail Chamber, I, Case No.: IT-69-22-T, 29 Nov, 1996.

لەسەر بنچینەی پێداویستییەکانی دادپەروەری و پرەنسیپە گشتییەکانی قانوون، پەسندیان نەکا[٣٢].

دەبێ ئەوە بزانین کە باش بەجێگەیاندنی دادرەویی لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیداو سەرکەوتنی دادگە لە ئەرکەکانیدا، پشت بە هاریکاریی دەوڵەتان لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا دەبەستێ بە تایبەتی لەو کاروبارانەدا کە ماددە ٢٩ی پێڕەوی ئەساسیی ئەژماری کردوون:

١- هاریکاری دەوڵەتان لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا لە لێوەکۆڵین و دادگاییکردنی ئەو کەسانەی بە پێشێلکارییە زلەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی تاوانبار کراون.

٢- دەبێ دەوڵەتان بەبێ هیچ خۆگنخاندنێکی بێ پاساو، بە پیر هەر یارمەتی خواستنێکەوە، یان هەر فەرمانێکەوە بێن کە لە لایەن یەکێ لە دوو دایرەکەی دادگاییکردنەوە دەرچووبن. بۆ نموونە وەکو:

أ- دیاریکردنی پێناسەو شوێنی نیشتەجێبوونی کەسەکان.

ب- گوێگرتن لە قسەی شایەتان و پیشکەشکردنی بەڵگە.

ت- بەدەستەوەدانی تۆمەتپێکراوان، یان حەواڵەکردنیان بۆ بەردەم دادگەی نێودەوڵەتی.

مخابن، بێ لە بۆسنیاو هەرسك، دەنا هیچ کام لە دەوڵەتانی هەرێمی یۆگۆسلافیای جاران، تەنانەت دوا بەدوای مۆرکردنی رێککەوتننامەی ئاشتیی دایتۆن لە کۆتایی

---

[٣٢] وەکو دەزانین، دادگەی نێودەوڵەتی ، دادگەیەکی کاتیی تایبەتە Ad HOC لەوانەیە ویست و خواستی سیاسی بۆ فشارخستنە سەر ئەو دەوڵەتانە پەیدابێ کە لە زیندانەکانیاندا مەحکومکراو، حوکمەکانیان بەسەر دەبەن چ بۆ سووککردنی ئەو حوکمانە بێ، یان دەرکردنی لێبوردن، نەمازە لە دوای ئەوەی کە دادگەی نێودەوڵەتی ئەرکەکانی خۆی تەواو دەکا. ئەو سزایانەی کە لە ١٠ ساڵ و بەرەو ژوور زێتر نین هەر دەبێ جیبەجێ بن، نەخاسمە ئەوانە تاوانباری شەڕن و چاتر وایە لێیان نەبووردرێ، مەگەر بە بڕیارێك لەسەر راسپاردەی سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی و لەلایەن کۆمەڵەی گشتییەوە دەرچووبێ.

ساڵی ١٩٩٥ داو فشارو زۆری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش ئامادە نـەبوون هاریکـاریی لـە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا بکەن. دەکرێ بێژین کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی (سـربیا و کێوە رەش) لە هەمووان زێتر منجرو لاسار بووە و بەتوندی دژی هەر جێبەجێکردنی هەر فەرمانێکی گرتن لە ناو هەرێمی خۆیانـدا دەبـووەوە بـەو بیـانووەی دەبێـت سـربەکانی بۆسنیا و هاووڵاتییەکانی لەوێدا دادگایی بکرێن (ئەم ئامانجە هەرگیز جێبەجێ نەبووە). هەمان شت سەبارەت بە کۆماری سیربەکانی بۆسنیا Srpska[٣٣].

هەنووکەشی پێوەبێ، کرادزیچ و میلادچ بە لەخۆڕادیتنەوە هەڵدەسوڕێن و دادەسـوڕێن و بەر لە چەند مانگێك هەر دووکیان پۆستی فەرمییان هەبوو، ئەمە سەرباری ئـەوەی کـە سوود لەو پۆستانە بۆ گەڕان و سووڕان بە ئازادی وەردەگـرن و خۆشـیان بـە دیمـوکرات و ریفۆرمیست دادەنێن، هەرچی کۆماری کرواتیاشە، ئەوا بە شێوەیەکی نیوەچڵ، هاوکاری لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا دەکا[٣٤].

---

[٣٣] بۆسنیاو هەرسك بە پێی رێککەوتنی دایتۆن لە دوو قەوارە پێك دێت: کۆماری سربەکانی بۆسنیا Srpska و یەکیتیی موسڵمان- کرواتان.

[٣٤] هێشتا ئۆفیسی داواکاری گشتی راپۆرتی وای پێدەگا کە ژمارەیەك گومالێکراویان دیوە کە لە ئاهەنگە رەسمییەکانی بولگرادو پالی ئامادە دەبن، وێڕای ئەوەی کە دەیان فەرمانی گرتنیان بە کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی و کرواتیا داوە. ئەم فەرمانانە وەکو سکرتێری گشتی لە راپۆرتی خۆیدا باسی کردوون (تەگبیرگەلێکن کە دادگە بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان دایاندەسپێنێت).
مجابن، ئەنجوومەنی ئاسایش لە ١٩٩٦/١٠/٢دا، وێڕای راسپاردەی سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی و داواکاری گشتی بە هێشتنەوەی سزاکان لە سەر کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی لەبەر گوێپێنەدان بە فەرمانەکانی دادگە، سزا سەپێنراوەکانی سەر کۆماری ناوبراوی هەڵگرت.
بۆ زێتر وردەکاری، بۆ نموونە سەیری راپۆرتی سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی بەڕێز ئەنتۆنیۆ کاسییز بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش لە بارەی پێشسێلکارییەکانی یۆگۆسلافیا لەمەڕ پابەندبوون بە هاوکاریکردن لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیدا بکە. هەروا سەیری داخۆینامەی بەڕێز ریچارد گۆلدتسۆن داواکاری گشتی دادگەی نێودەوڵەتی (پێشان) لە ئاهەنگی دەرچوونی کۆمەڵەیەکدا لە ئەڵمانیا بکە.

داخوا دادگەی نێودەوڵەتی دەکارێ ئەو تۆمەتپێکراوانە، بەبێ ئامادەبوون لە دادگادا، دادگایی بکات؟

لە (بڕگە — د- ی ٤ی ماددە ٢١) دا هاتووە تۆمەتپێکراو دەبێ ئامادەی دادگا ببێ و داکۆکی لە خۆی بکات. بەم شێوەیە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی بە نەرێ وەلامی داوەتەوە و لە جیاتی ئەوە، دادوەرانی دادگە جۆرە کارڕاییەکیان دۆزیوەتەوە کە پێی دەگوترێ دادگاییکردن بە گوێرەی بنەمای ٦١ ی تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەوی و ڕێساگەلی سەلماندن، یان دەنگی قوربانییان. ئەم کارڕاییە، دادگاییکردنی پاشملە نییە، بەڵکە کارڕاییەکە لە چوارچێوەی پێڕەوی ئەساسیدا کە بڕیار نادا تۆمەتپێکراو گوناهبارە یان نا، لە هەمان کاتدا ڕێگە بە دایرەی دادگاییکردنیش نادا سزاگەل دەربکات[٣٥].

---

I.C.T.Y, President Cassese reports to Security Council on the continuining Villation by the FRY of its Obligation to cooperate with I.C.T.Y, the Hague, 23 May 1996.
I.C.T.Y, Commencement address by Justice Richard J. Goldstone at the European division of the Nuniversity of Maryland Uni, College at Mannheim, Germany, 26 May 1996.

[٣٥] سادەو ساکار ئەو ڕێوشوێنانە لە بارێکدا وەردەگیرێن کە فەرمانی نێودەوڵەتیی گرتن لە لایەن یەکێ لە دادوەرەکانی دادگەی نێودەوڵەتییەوە مۆر بکرێ. داواکاری گشتی، بڕوای بە دایرەی دادگاییکردن هێنا بێت کە هەموو کارڕاییەکی پێویست ئەنجامدراوە بە ئاگادارکردنەوەی دامودەزگاکانی ئەو دەوڵەتەشەوە کە گومانلێکراو کاری بۆ کردوون و دوا جێگە کە گومانلێکراوی لێ بووە، هەروا هەموو تەگبیرێکی تری پێویست کراوە بە بڵاوکردنەوەی تۆمەتبارکردنیشەوە لە ڕۆژنامەو هۆیەکانی ڕاگەیاندندا. دایرەی دادگاییکردن، دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە فەرمانی نێودەوڵەتیی گرتن دەربکاو بەڵگەی بەردەست پەسند بکا بە شێوەیەك کە بنەماو بنچینەی ئەوتۆ هەن ساغی بکەنەوە کە گومانلێکراو ئەو تاوانە، یان تاوانانەی کە دراونەتە پاڵی ئەنجامی داون. سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی دەبێ سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش لە هەر کارڕاییەك کە بە پێی ئەم ڕێسایە وەردەگیرێ،

ئەم کارڕاییە دوو سوودی بنەڕەتی هەیە: ڕێگە لە تۆمەتپێکراو دەگرێ، سوود لە بەجێنەگەیاندنی فەرمانی گرتن وەربگرێ، هەروا دەرفەت بەو دەوڵەتەش کە تۆمەتپێکراوی لێیە، نادا کە یارمەتی تۆمەتپێکراو بدا، ئەمە سەرباری گرنگییەکی تریش هەیە کە ئەویش پاراستنی بەڵگەو ئیفادەی شایەتان و بەکارهێنانیانە لە دادگەدا ، بەمەش لە فەوتان و کارتێنەکردن دەپارێزرێن[٣٦] .

---

ئاگادار بکاتەوە، یان لەو بارانەدا کە کە دەوڵەتێك هاریکاری دادگەی نێودەوڵەتی ناکات بە گوێرەی مادده ٢٩ی پێڕەوی ئەساسی.

[٣٦] یەکەمین دادگاییکردن، دادگاییکردنی گومانلێکراو Dragan Nikolic بوو، بگەڕێوە بۆ:
I.C.T.Y, Rule 61 hearing, Case No.: IT-94-2-R61 (Nikolic Case), 9 Oct. 1995.

هەروا بگەڕێوە بۆ: داخۆینامەی بەڕێز ریچارد گۆلدستۆن سەبارەت بە ڕێسای ٦١.
I.C.T.Y, Rule 61 hearing, opening statement by Justice Goldstone, Case No.: IT-94-2-R 61 (Nikolic Case), 9 Oct 1995.

لە ١٩٩٥/١٠/٣١دا سەرۆکی دادگەی نێودەوڵەتی، نامەیەکی وەشاند بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش و تیایدا لەو کارڕاییە پێڕەوکراوانە ئاگاداری کردەوە بە پێی ڕێسای ٦١ و هاریکاری نەکردنی سربەکانی بۆسنیا لە جێبەجێ نەکردنی فەرمانی نێودەوڵەتیی گرتن.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٥٠، سەرچاوەی پێشوو، دۆکیومێنتی ( S/1995/915).

فەرمانی نێودەوڵەتیی گرتن، ئەو ڕێوشوێنانەی کە بە پێی ڕێسای ٦١ و ئەوەشیان کە بە پێی هەردوو ڕێسای ٤١و ٤٢ و مافەکانی گومانلێکراو بە پێی مادده ٢١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی وەرگیراون و ئەو تۆمەتەی ئاراستەی کراوەو ئو کارڕاییانەی کە دەبێ لە حاڵەتی گرتنیدا بگیرێنەبەر، دەگرتە خۆ.

هەڵبەت وا دەخوازرێ، بە کورتی چاو بە گرنگترین پرسگەلێکی هاوپێوەند بە دادگەی تاوانگەریی یۆگۆسلافیای جاران و دادگەی نۆرمبێرگ و پێرەوی ئەساسیی دامەزراندنی هەردووکیان بگێڕیین[٣٧]:

- دادگەی نێودەوڵەتی ICTY، دادگەیەکە سروشتێکی میلیتاریستی و لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە بە گوێرەی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی UN دامەزراوە.

□ دادگەی نۆرمبێرگ، دادگەیەکی میلیتاریستی بوو، وەکو بەشێك لە سیاسەتی سەروبەرکردن، دامەزراوە.

- کاتێ دادگەی نێودەوڵەتی ICTY دامەزرا، هێشتا ململانەی چەکدارانە لە یۆگۆسلافیا بەردەوام بوو، ئەمەش وای کرد گەڕان بە دوای بەڵگەو جێبەجێکردنی فەرمانی گرتن، زۆر سەخت بێ.

□ شەڕ بە کۆتا هاتبوو، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان پێش دامەزراندنی دادگەی نۆرمبێرگ کۆنترۆلیان بەدەستەوە بوو، ئیدی کۆکردنەوەی بەڵگەو دیمانە لە گەڵ شایەتان و گرتنی داوالێکراوان ئاسان بوو.

- گرتنی زۆربەی گومانلێکراوو تۆمەتپێکراوان، دەستکردن بە دادگاییکردنی بۆ ماوەی نزیکەی دوو ساڵ دوای دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY ، دواخست.

---

[٣٧] پێشتر بە گشتی ستراکتۆری دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جارانمان روونکردەوە. هەروا پێویست دەکات ئاماژە بۆ دادگەی نۆرمبێرگیش بکەین تا بە هاوسەنگیی ستراکتوری و واقیعی کە بە کردەوە لە نێوان هەردوو دادگەکەدا هەیە، بگەین، بەبێ پشتگوێ خستنی پرەنسیپی گەشەکردن لە قانوونی نێودەوڵەتیدا. ئاماژە بۆ دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی دەکەین وەکو کورتکراوەی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی کە بە پێی رێککەوتننامەی لەندەن پەسندکراوە و هێماکەی (*)یە و ئاماژە بۆ دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران ICTY دەکرێ بە کورتکراوەی دادگەی نێودەوڵەتی و هێماکەی (-).

- زۆربەی تۆمەتپێکراوان پێش دامەزرانی دادگەی نۆرمبێرگ لە زینداندا بوون، ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو کە سێ مانگ و نیو دوای پەسند کردنی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نۆرمبێرگ، دادگاییکردن دەست پێ بکا.

- دادگەی نێودەوڵەتی ICTY دوو زمانی فەرمی ئینگلیزی و فەرەنسی و دوو زمانی نا فەرمی سیربی و کرواتیی تێدا بەکار دێ.

- دادگەی نۆرمبێرگ، سێ زمانی فەرمی هەبووە: ئینگلیزی، فەرەنسی و رووسی.

- ئێستا ژمارەی کارمەندانی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY (٣٣١) کەسە بە هەر سێ یاریدەدەری داواکاریی گشتیشەوە.

- دادگەی نۆرمبێرگ نزیکەی ١٠٠٠ کارمەندی هەبووە، کە زێتر لە سەد کەسیان داواکاری گشتی بوونە.

- دادگەی نێودەوڵەتی ICTY یەك داواکاری گشتی هەیە (هەر ئەویش نوێنەرایەتی داواکاری گشتی لە دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا دەکا).

- دادگەی نۆرمبێرگ، چوار سەرۆکی دەستەی داواکاریی گشتی هەبووەو هەر یەکەشیان سەر بە یەکێ لەو دەوڵەتانە بووە کە ڕێککەوتننامەی لەندەنیان مۆر کردبوو.

- دادگەی نێودەوڵەتی ICTY (١١) دادوەری هەیە کە لە دوو دایرەی دادگە ( هەر دایرەیەك ٣ دادوەری هەیە) و دایرەی تێهەڵچوونەوەدا (٥ دادوەر) کار دەکەن. هیچ دادوەرێکی جێگرەوەش نییە.

- دادگەی نۆرمبێرگ ٤ دادوەری هەبووە (هەر یەکەیان، جێگرێکیشی هەبووە) کە لە دانیشتەکانی دادگەدا ئامادە دەبوون، ئەگەر ئەندامێکی دادگە نەساغ کەوتبایە، یان لەبەر هەر هۆیەك نەیتوانیبایە ئەرکی سەر شانی خۆی رابپەڕێنێ، ئەوا جێگرەکەی شوێنی دەگرتەوە.

- تابلۆی ڕێساگەلی دادڕەوی و ڕێساگەلی سەلماندن لە دادگەی نێودەوڵەتیICTY، لە ١٢٥ مادده پێکدێت.

□ تابلۆی ڕێساگەلی دادرەوی و ڕێساگەلی سەلماندن لە دادگەی نۆرمبێرگدا، لە ١١ بنەما پێکدەهات.

- شایەدیی شایەتان لە دادگەی نێودەوڵەتیدا لە بەڵگەنامەی دۆکیومێنتی گەلێ گرنگترە.

□ بەڵگەی دۆکیومێنتی لە دادگەی نۆرمبێرگدا زۆر لە شایەدیی شایەتان گرنگتر بووە.

- لە دادگەی نێودەوڵەتیدا ICTY، دادگاییکردنی لە پاشملە نییە.

□ لە دادگەی نۆرمبێرگدا، بە گوێرەی مادده ١٢ی پێڕەوی ئەساسی دادگاییکردنی لە پاشملە ڕێگەی پێدرابوو. مارتن بورمان لە پاشملە حوکم درا.

– ئەو تۆمەتپێکراوەی لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا ICTY دادگایی بکرێ، جارێکی دی لەسەر هەمان تاوان لەبەردەم دادگەگەلی نیشتمانیدا دادگایی ناکرێتەوە.

□ دادگەی نۆرمبێرگ شیانی دوو جار دادگاییکردنەوەی تۆمەتپێکراوی لەسەر هەمان تاوان ڕێکنەخستووە. ئەو کەسەی لە بەردەم دادگەیەکی نیشتمانیی میلیتاریی، یان دادگەگەلی داگیرکارییدا دادگایی بکرابایە، یان ئەوەتا لەبەر ئەندامبوونی لە سازمانگەلێکی تاوانکارانە، یان لەبەر تاوانگەلێکی دی — دەکرا دادگەگەلی نیشتمانی حوکمی زێدەی بۆ ببڕێتەوە، سەرباری ئەو حوکمانەی کە دادگەی نۆرمبێرگ لەسەر هەمان تاوان بۆی بڕابووەوە.

- تۆمەتپێکراو بە پێی مادده ٢٥ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی مافی تێهەڵچوونەوەی هەیە.

□ بەپێی مادده ٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نۆرمبێرگ، مافی تێهەڵچوونەوە نەبووە، بڕیاری دادگە، دوابڕیار بووە، بە هیچ شێوەیەك بواری چاوپێداگێڕانەوە نەبووە.

- توندترین حوکمی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY ، زیندانیکردنی هەتا هەتاییە.

□ سزای لەسێدارەدان، توندترین بڕیاری دادگەی نۆرمبێرگ بووە.

هەرچی خاڵە وێکچووەکانی نێوان هەردوو دادگەکەیە، بریتین لە:

- دادگەی نێودەوڵەتی ICTYو دادگەی نۆرمبێرگ، دوو هەوڵی تایبەتن بۆ سەپاندنی قانوونی نێودەوڵەتی نەمازە قانوونی نێودەوڵەتی مرۆیی، هەروا بۆ سزادانی پێشێلکارانیش.
- هەردوو دادگەکە، دادگەی تاوانگریی تایبەتن ad hoc
- پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نۆرمبێرگ و دادگەی نێودەوڵەتی دانیان بە بەرپرسیارەتیی تاوانگریی تاکەکەسیی هێناوە.
- دادگەی نۆرمبێرگ و دادگەی نێودەوڵەتیICTY مافی دادگاییکردنێکی دادپەروەرانە بۆ داوالێکراوان دابین دەکەن، هەر چەندە مافی داوالێکراوان بە پێی ماددە ٢١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی ICTY جیاوازە لەو مافەی کە لە ماددە ١٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نۆرمبێرگدا هاتووە.
- لە هەردوو دادگەدا، داوالێکراوان دەتوانن شایەت بە قازانجی خۆیان بانگ بکەن.
- لە هەر دوو دادگەکەدا، ڕێوشوێنی پاراستنی شایەت و قوربانییان هەیە.
- هەر دوو دادگەکە ڕێگە بە گێڕانەوەی ماڵ و موڵك و کەلوپەلی زەوتکراو دەدەن کە بە ڕێگەی ناشەرعی دەستیان بەسەردا گیرابێت، جاران دادگەی نۆرمبێرگ ئەو ماڵ و موڵکەی دەخستەوە بندەستی ئەنجوومەنی چاوەدێریی ئەڵمانی و، ئێستا دادگەی نێودەوڵەتی ICTY فەرمان دەدا ماڵ و موڵکی دزراو بە خاوەنە شەرعییەکانیان بدرێتەوە.

### ٢-٢: دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتیی

راپۆرتی سکرتێری گشتیی UN بۆ ئەنجوومەنی ئاسایش لە دەروازەی دووەم و لە ژێر نێوی " دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی" هاتۆتەسەر دەستدانی دادگەو لە (برگەکانی ٢٣-٤٩) نێوەڕۆکی روونکردووەتەوەو لە (بڕگەکانی ٥٠-٦٨)[٣٨]یش مەوداو ئاقاری دیاریکردووە.

مادده ٢٩ی پێڕەوی ئەساسیی دادگە، پابەندبوونەکانی دەوڵەتانی ئەندامی UN ی دیاریکردوون، بەو پێیەی ئەو دەوڵەتانە هۆی دەستەبەرن کە دادگەی نێودەوڵەتی بکارێ بەو دەستدانەی خراوەتە ئەستۆیەوە، رابگات.

دەستدانی رەسەنی دادگەی نێودەوڵەتی کە لە بنەڕەتەوە لە پێناوی ئەودا دروستکراوە ( دادگاییکردنی ئەو کەسانەیە کە بەرپرسیارن لەو پێشێلکارییە مەترسیدارانەی لە یۆگۆسلافیای جاراندا ئەنجامدراون). لەسەرینی ئەمەوە و لەراستیدا هەرچی دەستدانێکی لێرەدا باسیان لێوە دەکرێ لە هۆگەلێکی ئەساسی بۆ وەدیهێنانی ئەم ئارمانجە رەسەنە بەولاوە شتێکی تر نین. لەبەرئەوە لە بڕگەی دەسپێکی دیباجەی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیدا هاتووە (دادگەی نێودەوڵەتی کە ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی UN دایمەزراندووە، بە پێی بنەماگەلێك کە لەم پێڕەوە ئەساسییەدا هاتوون بە دادگاییکردنی ئەو کەسانە رادەگا کە بەرپرسن لە پێشێلکاریە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی کە لە هەرێمەکانی یۆگۆسلافیای جاراندا لە ساڵی ١٩٩١ەوە ئەنجامدراون)[٣٩].

---

[٣٨] نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سکرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، بڕگەکانی (٣٣-٤٩) ماددەکانی (٢،٣،٤،٥)ی پێڕەوی ئەساسیان لیٚداڕێژراوەو بڕگەکانی (٥٠-٦٨)یش ماددەکانی ٦-١٠یان لێداڕێژراوە.

[٣٩] تێبینی دەکرێ لە تەك ئەم ئامانجە رەسەنەدا، پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی بەدەق باس لە ئامانجێکی تری جیا دەکات کە بۆ لابردنی هەر شتێکی پێشێلکردنی قانوونی نێودەوڵەتی لێبکەوێتەوە هەوڵدەدا

لە پاڵ ئەم دیباجەیەدا، پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی لە ماددە ١دا باسی ئەم ئامانجە رەسەنەی کردووە (دادگەی نێودەوڵەتی دەسەڵاتی دادگاییکردنی ئەو کەسانەی هەیە کە بەرپرسیارن لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی لە هەرێمەکانی یۆگۆسلافیای جاراندا).

دیاریکردنی چەمکی وردی ئایدیای دەستدان، گرنگییەکی بەکردەوەی مەزنی هەیە کە هەندێ بە تایبەتی دادیارانی داکۆکی لێی دەپرینگێنەوە، ئەویش ئایدیای بەر فرەکردنی دەستدانی دادگەیە، لەمپەرو ئاستەنگ بخاتە بەردەم چالاکی دادگەوە لە رێگەی لێکدانەوەو شرۆڤەکردنی سیاسییانەوە کە بەرژەوەندو مانۆرو هەلومەرجی هەر کێشەیەك بە جیا دەستی تێوەربدەن و بەرزەفتی بکەن و ئیدی دواجار کار لە مافەکانی تۆمەتپێکراو بکەن. یان لە سەرێکی دیکەوە گوشین و وێکهێنانەوەو بەرتەسك کردنەوەی ئاقاری دەستدانی دادگە، پەکخستنی دادگەکەی لێبکەوێتەوە و لە دیدی داواکاری گشتییەوە، کار لە مافەکانی قوربانییان بکا.

### ٢-٢-١: سروشتی ململانەی چەکدارانە لە یۆگۆسلافیای جاراندا

گرنگترین ئاریشەگەلێکی تیوریی و پراکتیکی کە لە هەمانکاتدا، لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی کەوتبنەوە، دەستنیشانکردنی سروشتی ململانەی چەکدارانە لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا و ئەو ناکۆکییەیە کە تا چەند ئەم پرسە دەکەوێتە ناو بۆتەی دەستدانی دادگەوە.

---

کە ئەویش ( دایرەی دادگاییکردن، سەرباری سزای زیندانیکردن، دەکارێ فەرمانی گەڕاندنەوەی هەر موڵك و ماڵ وشتێك بدا بۆ خاوەنە شەرعییەکانیان کە بە هۆی رەوتارێکی تاوانکارانە بە زۆرلێکردنیشەوە، دەستیان بەسەردا گیرابێ) (بڕگەی ٣ی ماددە ٢٤ی پێڕەوی ئەساسی).

هەندێ ماددەی پێڕەوی ئەساسیی دادگەکە روون نین، داخوا بە تەنێ بەسەر ئەو تاوانانەدا جێبەجێ دەبن کە لە دوتوێی ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتیدا ئەنجامدراون، یان ئەوەتا بەسەر ئەو تاوانانەشەوە جێبەجێ دەبن کە لە ململانەی نێوخۆیی چەکدارانەدا ئەنجامدراون. لێوەکۆڵینی سروشتی ململانەی چەکدارانە زۆر بیروڕا سەبارەت بە مەسەلەی "تکییف"ی سروشتی ململانەی چەکدارانەوە لە یۆغۆسلافیای جاراندا دەوروژێنێ[٤٠].

لە ئالەکی دی، دەبێ تێبینی ئەوەش بکرێ کە گرنگیی جیاوازیدانان تەنیا بە گوێرەی هەردوو ماددەی ٢ و ٣ی پێڕەوی ئەساسی خۆدەنوێنێ. ماددە ٢ی پێڕەوی ئەساسی ئاماژە بۆ پێشێلکاریی زلی Grave Breaches رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف دەکا. هەرچی ماددە ٣یە، ئەوا هێما بۆ قانوون و نەریتەکانی شەڕ Laws and Customs of War دەکا. هەر دوو ئەم ماددەیە سروشتی ئەو ململانە چەکدارانەیەی کە بە سەریدا جێبەجێ دەبن، دیاری ناکەن. کەچی بە پێچەوانەوە ماددە ٥ی پێڕەوی ئەساسی دەستدان سەبارەت بە تاوانگەلی دژ بە مرۆڤایەتی بە دادگەی نێودەوڵەتی دەدا جا چ ئەو تاوانانە لە ململانەیەکی چەکدارانەی نێودەوڵەتیدا ئەنجامدرابن، یان نا نێودەوڵەتی.

---

[٤٠] دادیاری داکۆکی لە کیشەی تادیشدا تانەی لە ماددەکانی ٢و ٣ و ٥ی پێڕەوی ئەساسی داوە. ئەو ماددانە، داواکاری گشتی پشتی پێ بەستبوون لە تاواندانە پاڵ تادیشدا. دادیاری داکۆکی نیشانی دا کە هەندێ لەم ماددانە تەنیا بەسەر ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتیدا پەیڕەو دەکرێن، لە کاتێکدا تاوانەکان لە دوتوێی ململانەیەکی ناوخۆی چەکدارانەدا ئەنجامدراون، کە بە پێچەوانەوە تاوانی وا هەن لە کاتی ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتیدا ئەنجامدراون، لە کاتێکدا ماددەکان ئاماژە بۆ ململانەیەکی ناوخۆی چەکدارانە دەکەن و لە هەندێ جاردا دادیاری داکۆکی هەر لەبنەڕەتدا نکوڵی لە بوونی ململانەی چەکدارانە دەکرد، بەو پێیەی شەڕو کوشتار لە نێوان هێزی نا نیزامیدا بووە کە گروپ گروپ بوون و کاروکردەی ئاژاوەگێڕی و هەراو کێشەیان ناوەتەوە، نە زۆرتر نە کەمتر.

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para 65-66.

نەبوونی حوکمگەلی هاوشێوەی ئەوەی لە ماددە ٥ی پەیوەست بە تاوانگەلی دژ بە مرۆڤایەتیدا هەن، ئەو سەرنجە سەرەتاییە وەدەست دەدا کە ماددەکە تەنێ بەسەر جۆرە ململانەیەکی چەکدارانەدا" نێودەوڵەتی یان نێوخۆیی، جێبەجێ دەبێ.

ئەنجوومەنی ئاسایش لە بڕیاری ٨٢٧ی تایبەت بە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی بۆ یۆغۆسلافیای جاران، بە دەق باسی جۆری ململانە چەکدارییەی یۆغۆسلافیای جاران نەکردووە، داخوا ململانەیەکی نێودەوڵەتییە یان نێوخۆیی؟ چونکە مەبەستی بنچینەیی ئەنجوومەنی ئاسایش، دادگاییکردنی ئەو کەسانە بوو کە بەرپرسیارن لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی و پتەوکردنی ئاشتی و گەڕاندنەوەی تەنایی بۆ سەر باری جارانی خۆی، کەچی چەندان فاکت هەن کە هاومانا و جێگیرن و دەکرێ ئەوەیان لێ هەڵێنجین کە ململانەی چەکدارانە لە یۆگۆسلافیای جاراندا ململانەیەکی نێودەوڵەتی بووە و بڕیارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشیش سەرنجیان داوە با بەناو ناوی ئەو قانوونەی نەهێنابێ کە پەیوەستە بە ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتیشەوە. چونکە ئەنجوومەنی ئاسایش لەسەر ئاماژەکردن بۆ پێشێلکاریی زلی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنیف و پراکتیزەکردنی گشتیی ڕێککەوتننامەکانی جنیف راهاتبوو ململانەیە چەکدارییەی وەکو ململانەیەکی نێودەوڵەتی دادەنا، بە پێچەوانەوە ئەنجوومەن ئاماژەی بۆ ماددە سێی هاوبەشی نێوان m ڕێککەوتننامەکانی جنێف و پرۆتۆکۆلی دووەمی سەرباری ئەو ڕێککەوتننامانە دەکا، کاتێك کە سروشتی ململانە چەکدارییەکەی بە ناوخۆیی بدابایە قەڵەم[41].

---

[41] بڕیاری ٩٢٥ لە ٨ی ٥ی ١٩٩٤دا تیایدا هاتووە: ئەنجوومەنی ئاسایش بەو پەڕی نیگەرانییەوە سەرنجی ئەو راپۆرتانە دەدا کە ئاماژە بۆ کاروکردەی جینۆساید دەکەن لە روانداو لەم رەوتەدا، جەخت دەکاتەوە کە جینۆساید تاوانگەلێکی لێدەکەوێتەوە کو بە گوێرەی قانوونی نێودەوڵەتی سزا دەدرێن".

بەهەمان شێوە بڕیاری ٩٣٥ی ١٩٩٤/٧/١ دەڵێ : ئەنجوومەنی ئاسایش داخ و پەژارەی زۆر بۆ ئەو راپۆرتە بەردەوامانە دەردەبڕێ کە ئاماژە بۆ پێشێلکاریی زەق و بەربڵاو و بەرنامە بۆ دارێژراوی قانوونی نێودەوڵەتی دەکەن کە کاروکردەی جینۆسایدیان لە رواندا لە خۆگرتووە، دووبارە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو کەسانەی ئەم

بیرۆبۆچونی دیش هەن کە ئایدیای ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی لە یۆگۆسلافیای جاراندا پەسند دەکەن. لە نێو ئەو بیروبۆچوونانەدا، لیژنەی پسپۆران کە بەپێی بریاری ٧٨٠ی ئەنجوومەنی ئاسایش دامەزرابوو، راپۆرتی لیژنەی مافەکانی مرۆڤ کە سەرۆك وەزیرانی پێشووی سوید مازۆفیسکی سەرۆکایەتی دەکرد[٤٢]، لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کارناس و پسپۆرانی قانوونی نێودەوڵەتی[٤٣].

---

پێشێلکارییە زل و زەقانەی قانوونی نێودەوڵەتی مرۆییان ئەنجامداوە، یان فەرمانیان دەرکردووە ئەوا بەرپرسیار دەبن بە بەرپرسیاری تاکەکەسی لە راست ئەو پێشێلکاریانەو دەدرێنە دادگا.

لە بریاری ٩٥٥ی ١٩٩٤/١١/٨دا، دەبینین دانپیانانێکی پەنامەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی تێدایە کە ململانەی چەکدارانە لە رواندا ناوخۆیی بووە و ئەمەش لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بەرواندا دەردەکەوێ کە دەستدانی بابەتی دادگەکە پێشێلکارییە زلەکان و پێشلکارییەکانی قانوون و نەریتەکانی شەڕی نەگرتۆتەوە، بەڵکە تەنیا پێشێلکارییەکانی ماددەی سێی هاوبەشی نێوان رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و پرۆتۆکۆلی دووەمی سەرباری ساڵی ١٩٧٧ی گرتۆتە خۆ سەرباری جینۆسایدو تاواتگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی کە لە هەردوو جۆری ململانەدا دێنە جێبەجێ کردن و ئەم بنەمایانەش بەسەر ململانەی ناوخۆی چەکدارانەدا دێنە جێبەجێ کردن.

پەسندکردنی لێکدانەوەی بریارەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش بەو مانایە نییە کە تەنیا بە دەقەکانەوە بنووسێین بەڵکە دەبێ ئەم دەقانە وەکار بخەین و بەشێوەیەك لێیان حاڵی بین کە لە گەڵ ئەو ئامانجەی مەبەستە، رێك بێتەوە.

Ibid, para, 65

[٤٢] لیژنەی کارناسان لە برگە ٤٥ی راپۆرتی یەکەمی خۆیدا، سەبارەت بە سروشتی ململانەکە روونی کردەوە کە "سروشت و ئالۆزو پالۆزیی ململانەکە، کە تیایدا چەندین رێککەوتننامە لە نێوان لایەنە پێکناکۆکەکان لەمەڕ جیبەجێکردنی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی مۆرکراون، روونی دەکەنەوە کە قانوونی پێرەولێکراو، ئەو قانوونەیە کە لە ململانە نێودەوڵەتییە چەکدارییەکاندا لە هەموو هەرێمی یۆگۆسلافیا جێبەجێ دەکرێ"

U.N, 1st Interim report of the commission, op, cit, para 45.

هەروا راپۆرتی کۆتایی لیژنەکە هەمان تێڕوانینی دەرپریەوە کە تیایدا هاتووە:

"ئەگەر ململانەکە وەکو ململانەیەکی نێودەوڵەتی پۆلینکرا، ئەوا پێشێلکارییە زلەکانی رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف بە پرۆتۆکۆلی یەکەمی سەربارو پێشێلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ دێنە

جێبەجێکردن، خۆ ئەگەر ململانەکەش بە ململانەیەکی ناوخۆ داندرا ئەوا مادده سێی هاوبەشی نێوان ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و پرۆتۆکۆلی دووەمی سەرباری ساڵی ١٩٧٧ و مادده ١٩ی ڕێککەوتننامەی لاهای لەمەڕ پاراستنی ملك و ماڵی کولتووری دێنە پەیڕەو کردن، هەروا تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی و جینۆسایدیش بە بێ گوێدانە سروشتی ململانەی چەکداری دێنە جێبەجێکردن"

U.N, Final Report of the Commission of Experts (Yugoslavia), 27 May 1994, Doc (S/1994/674), para, 42-44

I.C.T.Y, Separate Opinion of the Judge Li on the Defence Motion for Interlocutory Appeal Jurisdiction, 2 Oct. 1995, para, 18

[٤٣] ئۆرین براین (ڕێکخەری ئەمریکایی لە بۆسنیاو هەرسك) دەڵێ:

"شتی هەرە گرنگ، ئەوەیە کە ململانەکە ڕاست ورەوان و بەروونی ململانەیەکی نێودەوڵەتییە: ٣ نەتەوە (دەوڵەت) لە دوو هەرێماندا جەنگان، هاوڕێ لە گەڵ ژمارەیەك لە لایەنگران و جەنگاوەردا کە لە باتی لایەنەکەی تردا کار دەکەن، مەرج نییە جەنگاوەران سەر بە یەك نەتەوە (دەوڵەت) بن، چونکە ئەم شتە پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە، سەروەختێك هەندێ ئۆکرانی لە شەڕی جیهانیدا لە تەك ئەڵمانیادا دەجەنگان، ئایا دەشێ بوترێ کە جەنگەکە نێوخۆیی بووە (دژی دەوڵەتی سۆڤیەت).

I.C.O, Brien, The International Tribunal for Violation of IHL, op, cit, p. 647.

هەروا حکوومەتی بۆسنیاو هەرسك بە ڕەسمی لە ١٩٩٢/٦/٢٢دا جاڕیاندا کە لە حاڵەتی شەڕدان و روونیان کردەوە:

"بۆسنیاو هەرسك بووە بە قوربانی کارێکی دەستدرێژکارانەی کۆماری سربیا، کۆماری کێوەڕەش "مۆنتینگرۆ"، سوپای گەلی یۆگۆسلاڤیا و ئەو هەرێمانەی حزبی دیموکراتی سیربی فەرمانڕەواییان دەکا".

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیۆمێنتە فەرمییەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش، ساڵی ٤٧، پاشکۆی مانگی نیسان و ئایارو حوزەیرانی ١٩٩٢، دۆکیۆمێنتی S/24214.

بە گوێرەی بڕگە(١)ی مادده دووی هاوبەشی نێوان ریککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف، ئەوا سەر لەبەری ڕێککەوتننامەکان لە حاڵەتی جاڕدانی شەڕا، دێنە جێبەجێکرن. ئیدی بە جاڕدانی شەڕ لە لایەن بۆسنیاو هەرسکەوە ململانە چەکدارییەکە بە ململانەیەکی نێودەوڵەتی دێتە حیسابکردن.

وەلێ هەمەجۆریی ئەو ڕێککەوتننامانەی لە نێوان لایەنەکان خۆیاندا مۆرکراوە و هەندێ حوکمگەلی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی کە دەبێ بە پێی ئەو ڕێککەوتننامانە جێبەجێ بن، وەکو بەڵگەیەك دەهێندرێتەوە کە ململانەی چەکدارانەی یۆگۆسلافیا سروشتێکی هەمەجۆری هەبووە[٤٤]. هەروا بێتەوە رای سکرتێری گشتیی UN یش لە وردکردنەوەی دەستدانی کاتی دادگەکە ئەو سەرنجە دروست دەکا کە هیچ حوکمێك نییە ساغی بکاتەوە کە ململانەکە نێودەوڵەتی بووە یان نێوخۆیی[٤٥]. ئەگەر ئەم راو

---

[٤٤] لە ١٩٩١/١١/٢٧دا، نوینەرانی کۆماری سربیا و کرواتیا و سوپای گەلی یۆگۆسلافیا، ڕێککەوتن کە پابەندی بنەماگەلی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و پرۆتۆکۆلی یەکەمی سەرباری ساڵی ١٩٧٧ بن کە (لە ململانێیە نێودەوڵەتییە چەکدارییەکاندا) دێنە جێبەجێکردن و هیچ ئاماژەیەکیش بۆ بنەواشەکانی ماددە سێی هاوبەش کە پێوەندیی بە ململانەی چەکدارانەی غەیرە نێودەوڵەتییەوە هەیە نەکراوە. ئەمەش ئەو سەرنجەمان لا دروست دەکا کە ململانەیە چەکدارییەکە ململانەیەکی نێودەوڵەتی بووە. بە پێچەوانەوە لە ١٩٩٢/٥/٢٢دا لە نێوان سەرۆکی کۆماری بۆسنیاو هەرسك (عەلی عیزەت بیگۆڤیچ) و سەرۆکی حزبی دیموکراتی کرواتی (میلژینکۆ برکای) ڕێککەوتن بووە کە روونی دەکاتەوە کە ململانەکە سروشتێکی ناوخۆیی هەبووە کە پەیوەستە بە پێرەوکردنی ماددە سێی هاوبەشەوەو لە برِگەی ٣ی ئەم ڕێککەوتنەدا هاتووە کە لایەنەکان دەتوانن لەسەر پابەندبوون بە بنەواشەگەلی ڕێککەوتننامەکانی جنێفی پەیوەست بە ململانە نێودەوڵەتییە چەکدارییەکان، ڕێکبکەون.

[٤٥] سکرتێری گشتی لە راڤەکردنی ماددە ٨ی پێڕەوی ئەساسیدا روونیکردەوە کە دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی بە گوێرەی کات لە ١٩٩١/١/١ەوە دەست پێدەکات و ئەم رۆژە وەکو رۆژێکی بێلایەن هەڵبژێردرا کە هیچ بڕیارێ لەبارەی سروشتی ململانە چەکدارییەکە نادا بەدەستەوە کە داخوا نێودەوڵەتییە، یان ناوخۆیی.
نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سکرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، برِگەی ٦٢.
لە کاتێکا هەندێك پێیان وایە ئەمریکا لە ئاخاوتنەکەیدا ئاماژەی بۆ ماددە ٣ کردووە لە ساتەوەختی پەسندکردنی پێڕەوی ئەساسیدا کە تیایدا هاتووە:
"ماددەی سێی هاوبەشی نێوان ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و هەردوو پرۆتۆکۆلی سەربار، دەکەونە ناو ئاقاری ماددەی ٣ی پێڕەوی ئەساسیی پەیوەست بە پێشێلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕەوە"
ئەم ئاخاوتنە سروشتی دوو لایەنەی ململانەکە دەردەبڕێ دەنا بە پێچەوانەوە ئاخاوتنەکە بێ ئارمانج دەبێ.

بۆچوونانە– بێگومان- هەر یەکە بایەخ و بناخەی خۆی هەبێ، ئەوە هیچ ڕێگە لەوە ناگیرێ کە سروشتی ئەم ململانەیە لە هەندێ ڕووەوە نێودەوڵەتی و لە ڕووی تریشەوە نێوخۆیی بێ و ئەم ڕایەش لە گەڵ ئەحکامە گشتییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیدا لە شێوەی ئێستایدا ڕێکدێتەوە[٤٦].

تێبینی ئەوە دەکرێ کە دایرەی تێهەڵچوونەوە، بەو دەرەنجامە گەییوە کە ململانەگەلی چەکدارانەی ناو یۆگۆسلافیای جاران، مۆرك و سرۆشتێکی دوالیزمانەی هەبووە: هەم نێودەوڵەتی و هەم نێوخۆیی[٤٧].

---

بۆ زیاتر وردەکاری بگەڕێوە بۆ:

Theoder Meron, International Criminalization of Internal Atrocities, op, cit, p. 556.

[٤٦] لە کێشەی نیکاراگوا دژ بە ئەمریکا، دادگەی دادی نێودەوڵەتی I.C.J ڕوونیکردەوە کە:

"ململانەی نێوان هێزەکانی کۆنتراو هێزەکانی سەر بە حکوومەتی نیکاراگوا، ململانەیەکی چەکدارانەی وەسایە کە سروشتێکی نێودەوڵەتی نییە. ئیدی ئەو کاروکردانەی کۆنترا دژی حکوومەتی نیکاراگوا ئەنجامیان داوە ئەو قانوونەیان بەسەردا جێبەجێ دەبێ کە لە ململانەیە ناوخۆییەکاندا پەیڕەویان لێدەکرێ، هەرچی کاروکردەی ئەمریکاشە دژ بە نیکاراگوا ئەوا بنەما قانوونیەکانی تایبەت بە ململانە نێودەوڵەتییەکانیان بەسەردا جێبەجێ دەبێ"

I.C.J, Case Concerning Military and Paramilitary Activities in and Against Nicaragua, I.C.J. Reports 1986, p.3.

هەروابێتەوە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٩٨ی لیژنەی نێودەوڵەتیی خاچی سوور ململانەی چەکدارانە لە ئەنگۆلای وەکو ململانەیەکی چەکدارانەی نێودەوڵەتی حیسابکرد لە حاڵەتی دەستێوەردانی خوارووی ئەفریقاو وەکو ململانەیەکی چەکدارانەی ناوخۆ لە ڕووێکی دیکەوە.

بگەڕێوە بۆ:

H.P.Gasser, International and Non-International armed conflict, American University Law Review, Washington D.C, Vol, 33, 1983, pp. 145-161.

[٤٧] لە بڕیارەکەدا هاتووە:

بەم جۆرە دەبوایە دایرەی دادگاییکردن لە کاتی تەماشاکردنی تۆمەتی تۆمەتپێکراواندا، سروشت و مۆرکی ململانە لە شوێن و کاتی تاوانگەلی ئەنجامدراودا دیاری بکا[٤٨].

**٢-٢-٢: دەستدانی بابەتیی دادگەی نێودەوڵەتی**

دەبێ دەستدانی بابەتیی دادگەی نێودەوڵەتی دیار بکرێ تا لە گەڵ دەستدانەکانی دادگەگەلی نیشتمانیدا لە هەمبەر یەکدا نەوەستن و لە لایەکی دییەوە لە سەروەریی

---

"ململانەکانی ناو یۆگۆسلافیای جاران دەکرێ بە پێی کات و شوێن بۆ ململانەی چەکدارانەی ناوخۆ، یان نێودەوڵەتی، یان بەهەڤڕا پۆلین بکرێن".

لە سیاقی بڕیارەکە گوتراوە:

" ململانەی یۆگۆسلافیای جاران هەراو بوو، بووە ململانەیەکی نێودەوڵەتی بە هۆی تێوەگلانی سوپای کرواتیا لە بۆسنیاو هەرسك و تێوەگلانی سوپای گەلی یۆگۆسلافیا لە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە کرواتیاو بۆسنیاو هەرسك تا خۆکێشانەوەی رەسمی لە ١٩٩٢/٥/١٩دا ئا بەم شێوەیە مەوداو ئاقاری ململانەی چەکدارانە بەرتەسك بووەوە بۆ نەبەردو شەڕی نێوان هێزەکانی حکوومەتی بۆسنیاو هێزە یاخیبووەکانی سربی بۆسنیا، هەروا شەڕو کوشتاری نێوان هێزەکانی کرواتیاو هێزە یاخیبووەکان لە سیربی کرایینا و ململانەکە بووە ململانەیەکی چەکدارانەی ناوخۆ (ئەگەر تێوەگلانی راستەوخۆی کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی نەسەلمێندرێ).

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para 72, 78.

[٤٨] هەندێك رەخنە لە تکییف ـــی تاوانگەلی ئەنجامدراو لە لایان حکوومەتی بۆسنیاو هەرسکەوە دژ بە خەڵکی مەدەنی لە سربەکانی بۆسنیا دەگرن کە "پێشێلکاری زل و زەق نین" چونکە ئەو مەدەنییانە هاووڵاتی بۆسنیاو هەرسکن و کەسانی پارێزراو نین  کەچی تاوانگەلی ئەنجامدراو لە لایان سیربەکانی بۆسنیاوە دژ بە مەدەنییە بۆسنییەکان دەبنە پێشیلکاری زل و زەق، چونکە هێزەکانی سیرب بە بەشێ لە هێزەکانی کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی بە حیساب دێن".

Prof. G.H Aldrich, Jurisdiction of International Criminal Tribunal for the Former Yugoslavia, AJIL, Vol, 90, 1996, p.67.

Christopher Greenwood, International Humanitarian Law and the Tadic Case, EJIL, Vol 7, 1996, pp. 272-273.

نیشتمانیی دەوڵەتان کەمنەکاتەوە[٤٩]. چونکە هەم دادگەی نێودەوڵەتی و هەم دادگەگەلی نیشتمانی هەروەکو پێشتر روونمان کردەوە دەستدانی هاوبەشیان لەمەڕ دادگاییکردنی ئەو کەسانەوە هەیە کە بەرپرسیارن لە پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی.

پێڕەوی ئەساسی قامك بۆ دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی لە بارەی ئەو تاوانانەوە رادەکێشێت:

### ٢-٢-٢-١: پێشێلکاریی زلی رێکەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف ( تاوانەکانی شەڕ):

دادگەی نێودەوڵەتی، دەسەلاتی دادگاییکردنی ئەو کەسانەی هەیە کە پێشێلکاریی زلیان دەرهەق بە رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف کردووە، یان فەرمانی ئەنجامدانیان داوە، دەق ئەو کاروکردانەی خوارەوە کە دژ بە ( کەس و موڵك و ماڵی پارێزراو) [٥٠]، بە پێی حوکمگەلی رێککەوتننامەکانی جنێف، ئەنجامدراون، ئەمانەن:

---

[٤٩] Maria Castilo, La Competence du tribunal penal pour La Yougoslavie, R.G.D.I, Tome 98, 1994, p.64.

[٥٠] ئەو کەس و کەلوپەل و موڵك و ماڵانەی بە گوێرەی هەر چوار رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف پارێزراون:

- رێککەوتننامەی یەکەمی جنێف بۆ چێترکردنی رەوشی بریندارو نەساغی هێزە چەکدارەکان لە مەیدانی شەڕدا: کەسە پارێزراوەکان: کەسە پارێزراوەکان (ماددە١٣)، پاراستنی فەرمانبەرە هەمیشەییەکان (ماددە ٢٤)، پاراستنی فەرمانبەرە کاتییەکان (ماددە ٢٥)، فەرمانبەری کۆمەڵەکانی فریاکەوتن (ماددە ٣٤).
- ماڵو ملکی پارێزراو: ساختمان و کۆگاکان (ماددە ٣٣)، ماڵ و ملکی کۆمەڵەکانی فریاکەوتن (ماددە٣٤)، پاراستنی هاتوچۆی پزیشکی (ماددە٣٥)،
- رێککەوتننامەی دووەمی جنێف بۆ چێترکردنی رەوشی بریندارو نەساغ و نوقمبووانی هێزی چەکدار لەناو دەریاکاندا:

١-  کوشتنی بە ئانقەست

٢-  ئەشکەنجەدان، یان رەوتارکردنی نامرۆڤانە بە تاقیکردنەوەی تایبەت بە بایۆلۆژیشەوە.

٣-  بە ئانقەست ئێش و ئازار گەیاندنی توند ، یان زیان گەیاندنی پڕ مەترسی بە لەشساغی، یان بە تەندروستی.

٤-  بەسەریەکداروخاندنی ماڵ و موڵك، یان دەستەبەسەرداگرتنیان بە شێوەیەکی فرەوان کە پێداویستیی جەنگی پاساوی نەداتەوە.

٥-  ناچارکردنی دیلەکانی شەڕ، یان کەسانی سڤیل کە لە هێزەکانی دەوڵەتی دژمندا خزمەت بکەن.

٦-  بە ئانقەست بێ بەشکردنی دیلی جەنگ، یان خەڵکی سڤیل لە مافی دادگاییکردن بە شێوەیەکی رێکوپێك و دادپەروەرانە.

٧-  تەرەکردن، یان راگواستن و گلدانەوەی ناڕەوایانەی خەڵکی سڤیل.

٨-  بەبارمتەگرتنی خەڵکی سڤیل.

---

کەسە پارێزراوەکان: کەسە پارێزراوەکان (مادده١٣)، پاراستنی کارمەندانی کەشتی و خەستەخانەکان (مادده٢٦)، پاراستنی کارمەندانی کەشتیگەلی تری پزیشکی و ئایینی (مادده٢٧). کەلوپەلی پارێزراو: ئاگادارکردنەوە لەمەڕ کەشتیگەل و خەستەخانان و پاراستنیان (مادده ٢٢)، کەشتیگەلی خەستەخانە کە کۆمەڵەکانی فریاکەوتن و تاکگەلی ئەم یان ئەو لایەنی ململانە یان وڵاتانی بێلایەن بەکاریان دێنن (مادده ٢٤)، پاراستنی قاوشی نەساغان لەسەر کەشتیگەلی جەنگی (مادده٢٧).

- رێککەوتننامەی سێیەمی جنێف لەبارەی رەوتارکردن لە گەڵ دیلەکانی شەڕدا. کەسە پارێزراوەکان بە گوێرەی مادده ٤ی رێککەوتننامەی چوارەمی جنێف سەبارەت بە پاراستنی خەڵکی سڤیل لەکاتی شەڕدا، کەسە پارێزراوەکان: ناساندنی کەسە پارێزراوەکان (مادده٤)، کارمەندانی خەستەخانان (مادده٢٠).
- ماڵ وملکی پارێزراو: پاراستنی خەستەخانان (مادده ١٨)، راگرتنی پاراستن لە خەستەخانان (مادده١٩)، پاراستنی هۆیەکانی گواستنەوەی زەوینی و دەریایی (مادده٢١)، هۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی (مادده ٢٢)، قەدەخەکردنی تەگبیری تۆڵەئەستاندنەوە لە کەسە پارێزراوو ماڵو ملکەکانیان (مادده ٣٣)، کاروکردەی نایاسایی کاولکاری (مادده ٥٣)، گرتنی خەستەخانان (مادده ٥٨).

ئەم ماددەیە بە تەنێ بەسەر ململانەی نێودەوڵەتیی چەکدارانەدا جێبەجێ دەبێ، وێڕای ئاماژەگەلێك هەن کە ئەم ماددەیە دەکرێ لە ململانەی چەکدارانەی نا نێودەوڵەتیشدا جێبەجێ ببێ[٥١].

---

[٥١] دادوەر (جۆرج ئەبی صەعب – ئەندامی دایرەی تێهەڵچوونەوە) لە بۆچوونێکی سەربەخۆدا روونیکردەوە کە ئەم ماددەیە و ماددەکانی ٣ و ٤و ٥ی پێڕەوی ئەساسی بەسەر ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی و ناوخۆیدا پەیڕەو دەکرێن.

I.C.T.Y, Separate Opinion of Judge Abi- Saab on the defence motion for Interlocutory appeal on Jurisdiction, Case No.: IT-94-I-AR72, 2 Oct. 1995, p.6.

لە کورتە نامەیەکدا کە ئەمریکا بە دادگەی داوە روونیکرۆتەوە:

"پێشێلکارییە زل و زەقەکانی ماددە ٢ی پێڕەوی ئەساسی دادگەی نێودەوڵەتی وەکو چۆن لە ململانەی چەکدارانەی بە سروشت نێودەوڵەتیدا پەیڕەو دەکرێن ئا ئاواش لە ململانەی چەکدارانەی ناوخۆشدا دێنە جیبەجێکردن"

I.C.T.Y, Amicus Curia, Submission of the government of the U.S.A, concerning Certain arguments made by Counsel for the accused in the Case of the Prosecutor of the Tribunal v. Tadic, Case No.: IT- 94- I T, 17, July 1995, p. 35.

هەندێك پێیان وایە وێڕای ئەوەی کە ئەم پوختەیە هێزێکی قانوونیانەی پابەندکاری بۆ لێکدانەوەی ماددە ٢ نییە، وەلێ دیدو تێڕوانینی یەکێ لە دەوڵەتەکانی هەمیشە ئەندام لە ئەنجوومەنی ئاسایش دەردەبڕێ و لە راستیدا قانوونی نێودەوڵەتیی عورفی وا پەرەی ئەستاندووە کە بە دیدی ئەم دەوڵەتە، ئەو پێشێلکارییە زل و زەقانەی لە ململانەی چەکدارانەی ناوخۆش ئەنجامدراون بگرێتەوە و ئاماژەی تازەی گرنگیش هەیە کە هەراوبوونی بنەماکانی "پێشێلکارییە زل و زەقەکان"ی رێککەوتننامامەکانی جنێف، هەموو جۆرەکانی ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی دەگرتەوە.

لە ١٩٩٤/١١/٢٥دا دادگەیەکی دانمارکی لە کێشەی Refic Saric دا، کە هاووڵاتییەکی کرواتی و بە ئەنجامدانی تاوانگەلێك گوناهبار کرابوو لە کامپێکی کرواتی لە ناوچەی Dretelj لە بۆسنیا بە خۆی چوار کەسی دیکە کە پۆلیسی کرواتی بوون لە ١٩٩٣/٨/٥دا، بە پشتبەستن بە ماددەکانی ١٢٩ و ١٣٠ی رێککەوتننامەی سێیەمی جنێف ( پەیوەست بە سزای تاوانکارانە کە دەوڵەتە رێککەوتووەکان لە بۆ ئەو کەسانەی دەبڕنەوە کە یەکێ لە پێشێلکارییە زل و زەقەکانی رێککەوتننامەی سێیەمیان ئەنجامداوە، یان

چەندین تێبینی لەسەر ئەم ماددەیە هەیە، یەکەمیان: ئەم ماددەیە هەموو ئەو کاروکردانەی لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا بە تایبەتی دژی موسڵمانانی ئەوێ ئەنجامدراون، ناگرێتەوە، بۆ نموونە باس لە بەزۆر راگواستنەوە نەکراوە و ماددەکە بە دەق ناوی کارەکانی هێناوە نەك وەکو نموونە هەروەکو لە ماددەی **٣**ی پێڕەوی ئەساسیدا وایە. ئەم رێککەوتننامانە رێگەی جێبەجێکردنی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەروا تەنیا پشت بە پێشێلکاریی زلی رێککەوتننامەکانی ساڵی **١٩٤٩**ی جنێف بەستراوە بەبێ گەڕانەوە بۆ هەردوو پرۆتۆکۆلی سەرباری **١٩٧٧** واتە بەبێ ئاماژەدان بۆ ئەو کارانەی لە هەردوو پرۆتۆکۆلەکەدا هاتوون[٥٢].

---

فەرمانی ئەنجامدانیان دەرکردووە)و ماددە ١٤٦ و ١٤٨ی رێککەوتننامەی چوارەمی جنێف، بە بێ ئەوەی کە ئاماژە بۆ ئەم تاوانانە بکات کە داخوا لە ململانەیەکی چەکدارانەی ناوخۆدا یان نێودەوڵەتیدا ئەنجامدراون، دادگەکە بە پشتبەستن بەو ماددانە و ماددەی تری پێوەست لە قانوونی سزادانی دانمارکی بڕیاری خۆی دا.

Danish High Court, Western Division, Third Chamber, the Prosecution v Refic Sagic, 25 Nov. 1994.

هەروابێتەوە لە پاڵ پێشێلکارییە زل و زەقەکانی قانوونی نێودەوڵەتی مرۆیی دا، بنەماکانی ماددەی سێی هاوبەشی نێوان رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنیف –یش لە قانوونیمیلیتاری ئەلمانی بەر سزا دەکەون.

Federal Ministry of Defence, Humanitarian Law in Armed Conflicts, Germany, Manual, 1992, para, 1209.

داواکاری گشتیش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە رێککەوتننامەی ئەلتەرناتیڤ هەن کە حوکمگەلی پێشێلکارییە زل و زەقەکانی رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنیفیان تێدا چەسپاوە و دەکرێ بەسەر ململانە نێوخۆییە چەکدارییەکاندا بێنە پێڕەوکردن.

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 85.

[٥٢] هەرچی پاڵوەدانە بە رێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف، ئەوا دکتۆر محمد ئەمین مەیدانی بە سروشتی چەکدارانەی ململانەی ناو یۆگۆسلافیای جاران پاساوی دەداتەوە، بێگوێدانە ئەوەی داخوا ململانەکە نێودەوڵەتییە، یان ناوخۆیی مادامەکێ بە کردەوە میکانیزمی چاوەدێریکردن هەن، وەلێ دادگەگەلی نێودەوڵەتیی تاوانکارانەیان بۆ دادگاییکردنی ئەوانەی بنەماکان پێشێل دەکەن دانەمەزراندووە.

**٢-٢-٢-٢: پێشێلکاریی قانوون و نەریتەکانی شەڕ**

ماددەی سێی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی، پێشێلکاریی دەرهەق بە قانوون و نەریتەکانی شەڕی ژماردوون، وەلێ ئەم ماددەیە وەکو ئاماژە بۆ کردن هاتووە نەك ئەژماردن و تایبەتاندن، هەروەکو ماددەی ٢ی گۆڕین. تاوانەکانیش ئەمانەن:

بەکارهێنانی چەکی ژەهراوی، یان هەر ماددەیەکی تر کە ئێش و ئازارو پێکەوتنی بێ پاساوو زیادەی لێبکەویتەوە.

١- پێداگرتن و زێدەرۆیی لە بەسەریەکدا رووخاندنی شار، گوند بێ ئەوەی کە پێداویستی جەنگی پاساوی بداتەوە.

٢- پەلاماردان، یان بوردومانکردنی شارو گوند خانوو ماڵی نا پارێزراو، جا بە هەر وەسیلەو ئەسپابی شەڕ هەر چی بێ.

٣- دەستبەسەرداگرتن، یان کاولکردن، یان بە ئانقەست زەرەرو زیان گەیاندن بە خانووبەرەی تایبەت بە خواپەرستی، یان هونەر، یان فێرکردن، یان زانست، یان شوێنەواری مێژوویی و شاکاری هونەری و زانستی.

٤- تالآن و بڕۆی ماڵ و موڵکی گشتی و تایبەتی.

ئەم ماددەیە لەسەر بنچینەی حوکمگەلی رێککەوتننامەی لاهای تایبەت بە قانوونگەل و نەریتی شەڕی زەوینی ساڵی ١٩٠٧ و تابلۆی پاشکۆی ئەم رێککەوتننامەیەو لێکدانەوەی دادگەی نۆرمبێرگ بۆ ئەم تابلۆیە دامەزراوە.

وەکو زانراوە ئاقاری ئەم پێشێلکاریانە، ململانەی نێودەوڵەتی چەکدارییە، کەچی دایرەی تێهەڵچوونەوە لە کێشەی تادیشدا بڕیاری دا کە ململانە چەکدارییە ناوخۆییەکانیش دەگرنەوە[٥٣].

---

د. محمد أمين الميدانى، المحكمه الجنائيه الدوليه ليوغوسلافيا السابقه، المجله العربيه لحقوق الانسان، تونس، عدد ٣، ايلول ١٩٩٦، ص ٤٦.

[٥٣] لە بڕیاری دایرەی تێهەڵچوونەوەدا هاتووە:

"زاراوەی پێشیلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ، زاراوەیەکی کلاسیکەو ئیستا زاراوەی ململانەی چەکدارانە Armed Conflict لە جیاتی شەڕ War بەتایبەتی لە ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف بەکاردێ. پێناسەی تاوانگەلی نێو ئاقاری ماددە ٣ راستیەکی گرنگ دەوروژێنێ. کە زاراوەی پێشێلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ زاراوەیەکی کلاسیکەو جاران بەکاردەهات لەکاتێکدا وشەی شەڕ یان قانوونگەلی شەڕ سیمای بەکارهاتوو بووە بەر لەوەی دوو زاراوەی تر لە جیاتی بکار بێن: ململانەی چەکدارانە Armed Conflict بەتایبەتی لە ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف و قانوونی نێودەوڵەتی پێڕەو کراو لە ململانە چەکدارییەکان، یان قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی International Humanitarian Law بەتایبەتی دوای کاریگەریی پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ و ئەمەش لە راپۆرتی سکرتیری گشتی خویاو دیارە.

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 87.

لە راپۆرتی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە: لایەی لاهای ریزگرتن لە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی دەگرتە خۆ کە ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێفیان بەسەردا جێبەجێ دەبن.

نەتەوە یەکگرتووەکان، راپۆرتی ١٩٩٣/٥/٣ی سکرتێری گشتی، سەرچاوەی پێشوو، برگەی ٤١. بەم شێوەیە دادوەرانی دایرەی تێهەڵچوونەوە بەو دەرەنجامە گەیشتن کە ماددە ٣ بریتییە لە قانوونی لاهای و قانوونی جنێف واتە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی، کە ماددە ٢ی پێڕەوی ئەساسی نایگرتەوە.

هەروا ئاخاوتنی چەند دەوڵەتێکی ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایش (فەرنسا، بریتانیا، ئەمریکا) سەبارەت بە ماددە ٣ ساغی دەکەنەوە کە ماددە ٣ بریتییە لە پابەندبوونە ئیمزا لەسەرکراوەکانی نێوان لایەنەکان کە لە نێویاندا ماددەی سێی هاوبەش و هەردوو پرۆتۆکۆلی سەرباری ساڵی ١٩٧٧ و هەر ڕێککەوتننامەیەکی تری نێوان لایەنەکان، هەن.

لە ئاخاوتنی فەرنسادا هاتووە:

"دەستەواژەی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ لە ماددەی ٣ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی بە تایبەتی بە رای فەرنسا سەرلەبەری پابەندبوونەکانی تایبەت بە قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی دەگرتەوە کە ڕێککەوتنیان لەسەر بووە لە نێوان لایەنە پێکناکۆکەکانی ململانەی چەکدارانە لە یۆگۆسلافیای جاراندا کە تاوانگەلیان تێدا ئەنجامدراوە"

U.N, Provisional Verbatim Record of the 3217 Meeting, 25 May 1993, Doc (S/PV. 3217), p. 11.

هەرچی ئاخاوتنی ئەمریکایی بوو ئەوا زۆر روونتر بوو:

"ئێمە وا تێدەگەین کە ئەندامانی ئەنجوومەن هەمان تێڕوانینی ئێمەیان لە راست پێڕەوی ئەساسیدا هەیە:

واته ئەم ماددەیە سەرلەبەری ئەو تاوانە ئەنجامدراوانەی ناکەونە نێو ئاقاری پێشێلکاریی زلی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف، یان جینۆساید ماددە/٤، یان تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی ماددە/٥ لە پێڕەوی ئەساسی دەگرێتەوە، بەتایبەتی:

١- پێشێلکاریی دەرهەق بە قانوونی لاهای لەدوتوێی ململانە چەکدارییە نێودەوڵەتییەکاندا.

٢- پێشێلکردنی حوکمگەلی ڕێککەوتننامەکانی جنێف بێ لەوانەی کە لە پێشێلکاریی زلی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێفدا باسکراون.

٣- پێشێلکارییەکانی ماددەی ٣ی هاوبەش و ڕێساگەلی دیکەی عورفی کە بەسەر ململانەی نێوخۆیی چەکدارانەدا جێبەجێ دەبن.

٤- پێشێلکاریی ئەو ڕێککەوتننامانەی لایەنەکان خۆیان پێوەی پابەندن پێیانەوە بەگوێرەی مەرجەکانیانەوە.

ئا ئەمە گرنگییەکی تایبەت بەم ماددەیە دەدا کە لەراستیدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تا ئەم ماددەیە هەموو تاوانەکان بگرێتەوە و هیچ بێ گوناهێك تاوانبار نەکرێ و هیچ تاوانکارێکیش لە سزادان قورتاری نەبێت[٥٤].

---

یەکەم: قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ کە لە ماددە ٣دا هەن، هەموو پابەندبوونەکان بە گوێرەی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی دەگرتەوە کە لە نێوان لایەنەکاندا ڕێککەوتنیان لەسەر بووە بە ماددە سێی هاوبەشی نێوان ڕێککەوتننامەکانی جنێف و هەرددو پرۆتۆکۆلی سەرباری ساڵی ١٩٧٧یشەوە .

Ibid, p. 15.

هیچ کام لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش نارەزایی لەسەر ئەم قسانە دەرنەبڕیوە، ئەمەش ئەو سەرنجە دەدا بەدەستەوە کە نیازو مەرامی ئەنجوومەن ئەوە بووە کە هەموو پابەندبوونەکان بگرتەوە.

[٥٤] بەسەرچاوەگرتن لەم سروشتە تایبەتەی ماددە ٣ی پیڕەوی ئەساسی، وا دەخوازێ چەند مەرجێکی پێویست هەبن تا ئەو ماددەیە بێتە پیڕەو کردن:

- پێشێلکارییەکان دەبێ لادان بن لە بنەماکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی.

### ٢-٢-٢-٣: جینۆساید

مەبەست لە جینۆساید ئەوەیە هەر کارێك لەم کارانەی خوارەوە بە نیـازو مـەرامی ( براندنەوەی بە تەواوی، یان پاژەکیی دەستەو گروپێکی نیشتمانی، یـان ئیتنـی، یـان رەگەزی، یان ئایینی) ئەنجام بدرێ (برگەی ٢ ی مادده ٤ ی پێڕەوی ئەساسیی دادگە) وەکو:

کۆشتنی ئەندامانی ئەم گروپە

زیان گەیاندنی زۆری جەستەیی، یان هۆشەکی

---

- پێشێلکارییەکان دەبێ مەترسیدار بن، یان بە وێنەیەکی دن، دەبێ پێشێلکاریی زل و زەقی ئەو بنەمایانە بن کە بایەخگەلی هەرە سەرو گرنگ دەپارێزن.

بۆ ساغکردنەوەی پەرەسەندنی قانوونی نێودەوڵەتی عورفی، دایرەی تێهەڵچوونەوە، گفتوگۆی لەسەر شەڕی ئەهلی لە ئیسپانیاو ململانەی چەکدارانەی ناوخۆی کۆنگۆ و سیلڤادۆر کرد، بۆ چاوگەی پێشینەی ئەم مەرجانە و پەرەئەستاندنی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بگەڕێوە بۆ بریاری ئەم دایرەی تێهەڵچوونەوەیە:

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para, 96-136.

لە بریاری دایرەی تێهەڵچوونەوەدا هاتووە:

" لەبەر رۆشنایی نیازو مەرامی ئەنجوومەنی ئاسایش و لێکدانەوەی بەمەست و لۆجیکانەی مادده ٣ و قانوونی نێودەوڵەتیی عورفی، ئەوا دایرەی تێهەڵچوونەوە دەگاتە ئەو دەرەنجامە کە ماددەی ٣ی پێڕەوی ئەساسی دەسەڵاتی بەسەر سەرجەم ئەو کاروکردانە دادەشکێ کە لە یۆگۆسلافیای جاراندا روویانداوە جا چ لە لە دوو تۆیی ململانەیەکی چەکدارانەی ناوخۆدا بووبن، یان نێودەوڵەتی".

I.C.T.Y, Decision for appeal on Jurisdiction, op, cit, para137.

لی Liدادوەر (ئەندامی دایرەی تێهەڵچوونەوە) لە بۆچوونێکی سەربەخۆدا، دژی بوونی پەرەئەستاندن لە قانوونی نێودەوڵەتیی عورفی وەستا کە مادده ٣ ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی بگرتەوە و روونی کردەوە ئەگەر پەرەستاندنێکی لەم بابەتە لە گۆرێ دایە، بۆ لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا بەرچاو نەگیرا، وەلێ لە گەڵ باقی دادوەرانی تری دادگەدا کۆکە کە مادده ٣ سەرلەبەری ئەو تاوانگەلە دەگرتەوە کە لە ماددەکانی ٢و٤و٥دا ناویان نەهاتووە.

I.C.T.Y, Separate Opinion of Judge Li, op, cit, para, 5-13.

زۆرکردن لەم گروپە کە لە کاودانێکدا هەڵبکەن و بژین بەو نیـازەی کـە بڕاندنـەوەی ماددیی بەتەواوی یان پاژەکیی گروپەکەی لێبکەوێتەوە.

سەپاندنی ڕێوشوێنێکی ئەوتۆ بەسەریاندا بەنیازی زاووزێ نەکردنی ئەم گروپە.

١- گواستنەوەی بەزۆرەملی زارۆو منداڵان لە گروپێکەوە بۆ گروپێکی دی.

ئەم کاروکردانە دووچاری سزادان دەبنەوە (بڕگە ٣ ماددە ٤):

١- جینۆساید

٢- دەست لە جینۆساید هەبوون

٣- دنەدانی ڕاستەوخۆو بەئاشکرا بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٤- خەریکبوون بە ئەنجامدانی جینۆساید

٥- بەشداریکردن لە ئەنجامدانی جینۆسایددا.

ئەم ماددەیە، ئەو تاوانگەلـە دەگرێتـەوە کـە لـە ڕێککەوتننامـەی قەدەخـەکردن و سزادانی جینۆساید پێناسە کراون[55]. ئەم تاوانانە بە بەشێکی قـانوونی نێودەوڵـەتیی

---

[55] ڕێککەوتننامەی قەدەخەکردن و سزادانی جینۆساید بەپێی بڕیاری ٢٦٠ (III) ی کۆمەڵەی گشتیی UN لە ١٩٤٨/١٢/٩ دا دەرچووە و بە گوێرەی دەقی ماددە ١٣، واتە دوای (سپاردنی)ی دۆکیـومێنتی بیسـتەم لـە ١٩٥١/١/١٢وە کەوتوەتە واری جێبەجێکردنەوە.

ئەم ڕێککەوتننامەیە لەو ڕێککەوتننامە دەگمەنانەیە کـە دەسـتدانی بـە دادگەیـەکی نێودەوڵـەتی تاوانکـاری بەخشیوە سەبارەت ئەو لایەنانەی کە دان بەم دەستدانە دەنێن. (ماددە ٦ی ڕێککەوتننامەکە). شایانی گوتنـە، I. C. J ناکارێ وەدوای هەولۆتەقەڵای تۆمەتدانە پاڵ تاکەکان بکەوێ، وەلێ بە هەر حاڵ، بۆسنیا و هەرسـك داوایەکی لە سەر کۆماری یۆگۆسلافیای فیدرالی (سربیا و کێوە ڕەش) لە ١٩٩٣/٤/٨دا قەید کرد، داوایەك کە لـە بـارەی بـەجێهێنانی ڕێککەوتننامـەی قەدەخـەکردنی جینۆسـایدو سـزادانییەوەیە بـە پێـی مـاددە ٩ی ڕێککەوتننامەکە.

(ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان لایەنە کۆنتراکتەکاندا سـەبارەت بـە لێکدانـەوەو پێڕەوکـردن و وەجێگەیانـدنی ئـەم ڕێککەوتننامەیە دێنە ئاراوە بە ناکۆکی تایبەت بە بەرپرسیارەتیی دەوڵەتێ لە دەوڵەتانیشـەوە لەمـەڕ بابـەتی جینۆساید، یان هەر کردەو کارێکی لە ماددەی سێدا بە دەق ناویان هاتووە (جینۆساید، یان پیلانگێڕان، یـان دنـەدانی بـە کۆمەڵکوشـتن و هـەوڵی ئەنجامـدان و بەشـداریکردن تیایـدا) دەخرێتـە بـەردەم دادگـەی دادی نێودەوڵەتییەوە لەسەر داخوازیی لایەنێك لە لایەنەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە).

عورفی[٥٦] بە حیساب دێن و سزا دەدرێن جا چ لە کاتی شەڕدا یان ئاشتیدا ئەنجام دراین (ماددە ١ی رێککەوتننامەکە)، ئەمەش بەم مانایە دێ کە لە ململانەی نێودەوڵەتی و غەیرە نێودەوڵەتیش جێبەجێ دەبێ.

مەرج ئەوەیە تۆمەتپێکراو نیازو مەرامی تاوانکارانەی بە ئاراستەی جینۆساید هەبێ ، هەروا بێتەوە ئەم نیازو مەرامەش بە مەبەستی براندنەوەی یەکجارەکی، یان پاژەکیی گروپە نیشتمانی، یان ئیتنی، یان رەگەزی، یان ئایینییەکە بێ. (برگەی ٢ی ماددە ٤ی پێڕەوی ئەساسی).

**٢-٢-٢-٤: تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی** Crimes Against Humanity

**بە پێی ماددە ٥ی پێڕەوی ئەساسی، دادگەی نێودەوڵەتی، دەسەڵاتی دادگاییکردنی ئەو کەسانەی هەیە کە بەپرسن لەو تاوانانەی خوارەوە دەرهەق بە خەڵکی سڤیل (جا چ لە ململانەی چەکدارانەی بە سروشت نێودەوڵەتی رووبدا، یان بە سروشتی ناوەخۆ).**

---

هەروا بە پێی ماددە ٨، هەر لایەنێکی ئەم رێککەوتننامەیە، دەشێ بگەڕێتەوە بۆ دەزگا تایبەتکارەکانی UN تا بە پێی پەیمانی UN ئەو رێوشوێنانەی بە گونجاویان دەزانێ بگرێتەبەر بۆ خۆپاراستن لە کردەکانی جینۆساید و سزادانی، یان هەر کارێکی تر لە ماددەی سێدا ناوی هاتبێ.

بە کردەوە، دادگە یەکجێ فەرمانی دا کە دەسبەجێ هەموو رێوشوێنێك کە لە دەسەڵاتی یۆگۆسلافیاوە بۆ قەدەخەگرتنی ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید، پەیڕەو بکرێ.

.3 & etc .j reports 1993, p .C .J, I .C .I

[٥٦] بگەڕێوە بۆ رای راوێژکاریی I. C. J، تایبەت بە روونکردنەوەی مانای قانوونی ئەو خۆگریانەی لە بارەی رێککەوتننامەی جینۆسایدەوە دەربڕاون.

I .C .J, Reservations to the convention the prevention and punishment of the crime of Genocide, Advisory Opinion, 28L3L1951, I .C .J reports, 1951, p .12 .

١- کوشتن

٢- جینۆساید

٣- کۆیلەکردن

٤- زیندانیکردن

٥- ئەشکەنجەدان

٦- تۆبزیگێکردن

٧- چەوساندنەوە لەبەر هۆکاری سیاسی، یان ئیتنی، یان ئایینی

٨- کاروکردەی دیکەی نا ئینسانی.

یەکەمین ئاماژە کە بۆ تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی کرابێ لە دادگاییکردنەکانی تاوانبارانی شەڕ بووە لە دوای شەڕی دووەمی جیهانەوە، کە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی میلیتاری (نۆرمبێرگ) پێناسەی بۆ کردوون و لە هەردوو بڕیارەکەی کۆمەڵەی گشتیی UN دا جەختیان لەسەر کراوەتەوە[٥٧].

[٥٧] ئەم تاوانگەلە لە مادده ٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی میلیتاریدا بە دەق باسیان لێکراوە و تیایدا هاتووە:

(تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی: کوشتنی بە ئانقەست، وەدەر نانی مرۆ، کۆیلەکردن، لە وڵات دەرپەڕاندن و هە رکارێکی نا مرۆڤانە و هەر ستەم و چەوسانەوەیەك لە بەر هۆکاری سیاسی، یان ئیتنی ، یان ئایینی دەرهەق بە دانیشتوانی سیڤیل چ بەر لە شەڕ، یان لە کاتی شەڕدا ئەنجامدرابێ لە کاتێکدا ئەم ستەم و چەوساندنەوانە لە ئاکامی تاوانێکی لە نێو دەستدانی ئەم دادگەیەدا هەبێ یان پێوەندیی پێیەوە هەبێ جا قانوونی نێوخۆ پێشێل بکا یان نا).

ئەمە لە هەردوو بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی UN دا، ٣(I) لە ١٩٤٦/٢/١٣ و بڕیاری ٩٥ (I) لە ١٩٤٦/١/١١.

نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی یەکەم، ١٩٤٦.

هەروا تێبینی دەکرێ قانوونی ژمارە (١٠)ی تایبەت بە سزادانی ئەو کەسانەی تاوانگەلی شەڕو تاوانگەلی دژی ئاشتی و سەلامەتیی مرۆڤایەتیان ئەنجامداوە لە مادده ٢ ج دا پێناسەی تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی دەکا

ئەم تاوانانە جۆرە مەترسییەکی ڕێژەییان هەیە و لە جغزو بازنەی نیشتمانی دەچنە دەرێ و سەرلەبەری مرۆڤایەتی دەگرنەوە و خۆیان لەو پاڵنەرو هۆکارانە لەو دیوی ئەنجامدانی ئەو تاوانانە هەن، دەبیننەوەو وا دەکەن ئەم تاوانانە بە تاوانگەلی قانوونی گشتی بژمێردرێن. ئەم تاوانانە وا دەخوازن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هەوڵ و تەقەلای خۆی بۆ سەرکوتکردن و سزادانیتاوانکاران یەکبخات و دادگەگەلی نێودەوڵەتیی تاوانکاری دابمەزرێنێ[٥٨].

پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران هیچ بەندیوارییەك لە نێوان ئەم تاوانانەی دەرهەق بە مرۆڤایەتی و تاوانە ئەنجامدراوەکانی دی ناخوازێ و دایرەی تێهەڵچوونەوە بەو دەرەنجامە گەییوە کە بەرتەسکیی سنوورو ئاقاری تاوانگەلی دەرهەق بەمرۆڤایەتی کە پێشتر دادگای نۆرمبێرگ دادانی پێداناوە، هیچ کار لە قانوونی نێودەوڵەتیی هاوچەرخ ناکات و بەم شێوەیە دادگەی نێودەوڵەتی پشت بە نوێباوترین ڕاڤەکردن و لێکدانەوە لەبارەی ئەم تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتییە دەبەستێ[٥٩].

---

بەبێ ئەوەی هیچ هێمایەك بۆ بەندیواری نێوان ئەم تاوانە و تاوانەکانی دی بکا (تاوانەکانی شەڕ، یان تاوانەکانی دژی ئاشتی)بە پێچەوانەی مادده ٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نۆرمبێرگەوە.

هەروابێتەوە لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتی لە پرۆژەی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاری، بەندیواری لە نێوان تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی و ململانەی چەکدارانەدا نەکردووە بە مەرج، هەروا بگەڕێوە بۆ گەڵاڵەنامەی کۆدی تاوانگەلی دەرهەق بە ئاشتی و تەنایی مرۆڤایەتی.

Christopher Greenwod, International Humanitarian Law and Tadic Case, op .Cit, p .282 .

٥٨C .Grynfogel, Un Concept Juridque en quete didentite, Le Crime Contre Ihumanite, R .I .D .P ., N .3-4, 1992, pp .1027-1049 .

٥٩I .C .T .Y, Decision for Appeal on Jurisdiction , op .Cit, para, 138-142 .

بەر لەوەی واز لە دەستدانی بابەتی بهێنین، دەخوازین ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە کۆمەڵەی گشتیی UN لە خولی ٢٣ی خۆیدا بڕیارێکی داوە کە تیایدا باس لە کاتبەسەرنەچوونی تاوانەکانی شەڕو تاوانەکانی دەرهەق بە مرۆڤایەتی دەکا[٦٠] و دوای ئەویش لە ساڵی **١٩٧٣**دا بڕیارێکی دی دەرچوو سەبارەت بە هاریکاریی نێودەوڵەتی بۆ بەدواداگەڕان و گرتن و تەسلیمکردنەوە و سزادانی ئەو کەسانەی گوناهبارن بە ئەنجامدانی تاوانەکانی شەڕ و تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی[٦١].

قانوونی سزاگەلی یۆگۆسلافیای فیدرالی جاران لە ماددەکانی (**١٤٢، ١٤٣، ١٤٦، ١٤٨، ١٥٤**)دا سزای بۆ پێشێلکاریی زل دەرهەق بە رێککەوتننامەکانی ساڵی **١٩٤٩**ی جنێف بە تایبەتی رێکەوتننامەی چوارەم داناوەو تاوانی دیکەشی خستۆتە پاڵیانەوە[٦٢].

---

[٦٠] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی لە سوڕی ٢٣، ژمارە ٢٣٩٢ی لە ١٩٦٨/١١/٢٦دا.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی ٢٣، ١٩٦٨.

[٦١] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی، خولی ٢٨، ژمارە ٣٠٧٤ لە ١٩٧٣/١٢/١٣.
نەتەوە یەکگرتووەکان، دۆکیومێنتە فەرمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، ساڵی ٢٨، ١٩٧٣.

[٦٢] Penal Code of the (SFRY), 28/9/1976 .

لە ١٩٧٧/٧/١دا کەوتە واری جێبەجێکردنەوە:

Official Gazetter SFRY, No .44/76 on 8/10/1976 articles 142, 143, 146, 148, 154 .

بگەڕێوە بۆ پاشکۆیەکانی (١-٣) لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کە بە خشتە بە پێی قانوونی سزادانی یۆگۆسلافیای جاران ئەو ماددانە و بەرانبەرەکانیان لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران نیشان دەدا.

بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بە سیاسەتی تاوانکاریی لە یۆگۆسلافیای جاراندا بگەڕێوە بۆ:

Dr .Ivan Jankovic & Dr .Vladan Vasilijevice, sentencing Policees and Practices in Former Yogoslavia, Belgrad, 1994 .

ئیدی ئا ئاوا ئەم قانوونە جیا لە قانوونگەلی ولاّتانی دی، تاوانەکانی ئـەژماردوون و پێناسەی بـۆ کـردوون و بـۆ هـەر یـەکێکیان سـزای دیـاریکراوی بـۆ دانـاون، واتـە تاوانەکانی قانوونی نێودەولّەتی لە نێو قانوونی تاوانکاریی نێوخۆیی داناوەو ئەمەش لە دەستاوێژە بەرترەکانی جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکانی سالّی ١٩٤٩ی جنێڤە و لە دوای شەڕی دووەمی جیهانیشەوە، دادگاکانی یۆگۆسلافیا لە چەند کۆمارێکی ناو فیدرالدا، چەندان بڕیاری گرنگیان داوە لە هەشـتاکاندا و گرنگترینیـان دەرهـەق بـەو کەسانە بوون کە لە گروپی Royal Army in the Homeland بـە سـەرکردایەتی جەنەڕال D. D. Mihajlovic دا خۆیان رێکخستبوو و بەرپرس بوون لە ئەنجامدادانی تاوانگەلی زل دژ بە بزاڤی ئازادیخوازی نیشتمانی NOP.

### ٢-٢-٣: دەستدانەکانی تری دادگەی نێودەولّەتی

دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین، دادگـەی نێودەولـّەتی تایبـەت بـە یۆگۆسـلافیای جـاران، دادگەیەکی تایبـەتی (ad hoc) کاتییـەو ئیـدی دیـاریکردنی دەسـتدانەکانی تـری (شوێن، کات، کەس)ی ئەم دادگەیە پێویستە، تا دادگەی نێودەولـّەتی بەشـێوەیەکی ئەوتۆ چالاکی خۆی پراکتیزە بکاو ئـەو مەبەسـتەی لـە پێناویـدا دامـەزراوە بـەدی بهێنێ. هەروەکو لە مادده ١ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەکـەوە روونـە، ئـەم دادگایـە دەستدانێکی بەگوێرەی کات هەیە بۆ دادگاییکردنی ئـەو کەسـانەی بەرپرسـیارن لـە پێشێلکارییە زل و زەقەکانی قانوونی نێودەولّەتیی مرۆیی کە لە یۆگۆسلافیای جاران لە سالّی ١٩٩١-ەوە ئەنجامدراون، وەلێ لە چ رۆژێکی ئەم سالّەدا؟.
لە ماددەی ٨ی پێڕەوی ئەساسیدا هاتووە کە لـە رۆژی یەکـەمی کـانوونی دووەمـی سالّی ١٩٩١-ەوە. هەروەکو ئاماژەمان پێکرد ئەم رۆژە رۆژێکی بـێ لایەنـە و هـیچ شتێ دەربارەی سروشتی ململانە لە یۆگۆسلافیا، یان هـەر مەسـەلەیەکی تـر بڕیـار نادا و نابڕێنێتەوە. هەروا ماوەی نێوان سـەرەتاو کۆتـایی دەسـتدان بـەگوێرەی کـات

دیاری نەکراوە، بەڵکە ئەم ماوەیە بە کراوەیی جێهێڵراوە. لەبەرئەوەی ئەو دەمەی ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاری دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتی پەسند کردووە، هێشتا ململانەی چەکدارانە بەردەوام بووە.

ئەگەر دەستدان بەگوێرەی کات لە ١٩٩١/١/١ —ەوە دەس پێبکا، ئەوا دادگەکە تایبەتکارە بە سزادانی ئەو کەسانەی لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا کاروکردەیان ئەنجام داوە، مەبەستیش لە تێرمی هەرێمی یۆگۆسلافیای جاران، ماددە ٨ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی دیاری کردووە و نیشانی داوە کە دەستدان بە گوێرەی شوێن دادگەکە هەموو هەرێمی کۆماری یۆگۆسلافیای سۆسیالیستی فیدرالی جاران دەگرێتەوە بە سنوورو فەزای زەمینی و دەریایی و ئاسمانییەکەیەوە.

هەروا ماددە ٧ی پێڕەوی ئەساسی، لەمەڕ چەمکی بەرپرسیارەتیی تاوانکاریی تاکەکەسییە Individual Criminal Responsibility (دەستدان بە گوێرەی کەس)، هەر کەسێ پلانی بۆ تاوانێ لەو تاوانانەی لەماددەکانی (٢،٣،٤،٥)ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی دا ئاماژەیان بۆ کراوە، داناوە، یان دنەی داوە، یان فەرمانی داوە، یان خۆی ئەنجامی داوە، یان بە هەر رێگەیەکی تر یارمەتی نەخشەدانان و ئامادەکاری، یان جێبەجێکردنی داوە، یان هان و ختختەی داوە، ئەوا وەکو کەسی خۆی، بەرپرسیارەتی تاوانکاری لە بارەی ئەم تاوانانە دەکەوێتە ئەستۆ (بڕگە١، ماددە٧)و جا پلەو پایەی فەرمی تۆمەتبار " سەرۆکی دەوڵەت، یان حکومەت بێ، یان هەر بەرپرسێکی حکومەتی بێ، لە بەرپرسیارەتی تاوانکاری نابوردرێ، یان سزای لەسەر سوك ناکا (بڕگە٢ ماددە٧)، هەروا بێتەوە ئەنجامدانی هەر کاروکردەیەکی کە لە ماددەکانی ٢ تا ٥ ی ئەم پێڕەوی ئەساسییەدا هاتوون، لە لایەن فەرمانبەرانەوە، ئەوا بەرپرسیارەتی تاوانکاریی لەسەر سەرۆکەکەی لانابا، ئەگەر ئەم سەرۆکە بەوەی زانیبێ کە ئەو فەرمانبەرە هاکا ئەو کارەی کرد، یان بەکردەوە ئەنجامی داوە، یان هۆی وا هەبن کە وای لێدەکەن پێی زانیبێ و سەرۆك

خۆی ڕێوشوێنی پێویست و ماقولی بۆ ڕێگە گرتن لە ئەنجامدانی ئەم کارانە پەیڕەو نەکردبێ، یان سزای ئەنجامدەرەکەی نەدابێ )(بڕگە ٣، مادده ٧). هەروا تۆمەتبار لەبەر فەرمانگەلی دەسەڵاتەکانی باڵا جا چ حکومەت بێ، یان هەر سەرۆکێکی باڵاتر لە خۆی لە بەرپرسیارەتی تاوانکاری نابەخشرێ ، وەلێ دادگەی نێودەوڵەتی بۆی هەیە سزای لەسەر سووك بکات، ئەگەر دیتی دادپەروەریی وا بخوازێ (بڕگە ٤ مادده (٧).[٦٣]

لە ڕاستیدا فیقهی نێودەوڵەتی جەخت لەسەر بەرپرسیارەتی کەسان لە مەڕ ئەو کارانە دەکەنەوە کە بە ناوی دەوڵەتەکانیانەوە، یان بۆ قازانجی دەوڵەتەکانیان ئەنجامی دەدەن و نابێ لەسەرینی ئەو کارانە دادگایی دەوڵەتان بکرێ، چونکە دەوڵەت کەسایەتییەکی واتاییە لە کەسایەتییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی گشتی، بەڵکە ئەوە تاکەکانن لە بەر پێشێلکردنی قانوونی نێودەوڵەتی، دادگایی دەکرێن[٦٤].

سەرلەبەری قانوونگەلی تاوانگەریی سەربازی و نیشتمانی جەخت لەسەر ئەم پرەنسیپە دەکەنەوە، ئەگەر بایەخی بیانووی فەرمانەکانی باڵا ( Superior

[٦٣] چەمکی بەرپرسیارەتیی تاوانگارانەی تاکە کەسی لە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩١٩ی فرسایەوە جیبەجێ کراوە. مادده ١٢٧. لە ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٤٥ی لەندەن لە مادده ٦-٨ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی میلیتاری (نۆرمبێرگ) هەروا لە مادده ٣ی گەڵاڵەنامەی کۆدی تاوانگەلی دژ بە ئاسایش و تەنایی مرۆڤایەتی. بەم نزیکانەش لە مادده ٦ و ٧ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی بە دەق باس لەم بەرپرسیاریەتییە کراوە.

[٦٤] بۆ زێتر شارەزابوون لە بەرپرسیارەتیی تاوانکارانە لە مەڕ تاوانگەلی تاکان بە گوێرەی قانوونی نێودەوڵەتی بگەڕێوە بۆ:

عباس هاشم الساعدی، جرائم الافراد فی القانون الدولی، رساله ماجستیر، جامعه بغداد، کلیه القانون والسیاسه، ١٩٧٦، ص ٣٣٣-٤٠١

Orders) لە بۆ سووککردنی سزا کارێکی بەڵگەنەویست بێ، وەلێ ناشێ ئەم بیانووە وەکو رێگر لە بەرپرسیارەتی بە هەند هەڵبگیرێ[٦٥].

شایانی گوتنە لەمبارەوە پرەنسیپی دووبارە دادگایینەکردنەوە لەسەر هەمان تاوان، لەباری قانوونییەوە لە پرەنسیپە ساغبۆوەو بەڵگەنەویستەکانە و لە ماددە ١٠ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیدا جێگەی کراوەتەوە، کە تیایدا هاتووە کە ناشێ و نابێ کەسێك لە بەردەم دادگەیەکی نیشتمانیدا لەسەر ئەو کارانەی لە چوارچێوەی پێڕەوی ئەساسیدا، بە پێشێلکاریی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی بە حیساب دێن، دادگایی بکرێتەوە ئەگەر پێشتر لە بەردەم دادگەی نێودەوڵەتیدا دادگایی کرابێ مەگەر ( برگە ٢ی ماددە ١٠):

أ- ئەو کارەی لەسەری حوکم کراوە، بە تاوانێکی ئاسایی لێکبدرێتەوە، یان

ب- دادڕەوییەکانی تەماشاکردنی کێشەکە لەبەردەم دادگای نیشتمانیدا، بایەخگەلی پاکی و بێگەردی و سەربەخۆییان تیدا نەبووبێ، یان بۆ پاراستنی تاوانبار لە بەرپرسیارەتی تاوانکاری ئاراستە کرابن، یان داواکاری گشتی بە پێی پێویست دەوری خۆی نەگێڕابێت.

---

[٦٤]I.C.T.Y, prosecutors brief on aggravating and mitigating factors case , No.: IT-96-22 T Drazen Frdemovic, 11 Nov, 1996, pp. 1-3.

ئۆفیسی داواکاری گشتی لە پوختەیەکدا بۆ ئەم دادگەیە، ئەو سزایانەی کەبەسەر یۆگۆسلافیای جاراندا دەسەپێنرێ و هەلومەرجی سووککردن و هەلومەرجی توندا لە نێوان فەرمانەکانی باڵا و هەلومەرجی توندکردن و سووککردن لە هەندێ دەوڵەتدا کە پێرەوی لە سیستەمی ئەنگلۆ-ساکسۆنی دەکەن (ئینگلتەرا، ئەمریکا، کەنەدا، ئوسترالیا) ئەمە سەرباری ئەو دەوڵەتانەی پێرەوی لە سیستەمی ئەورووپی دەکەن (ئیسپانیا، فرەنسا، کۆستاریکا، ئەلمانیا)ی لاتینی.

له دیاهیدا نابێ ئەوەمان بەسەردا تێپەڕێ کە دەبێ ئاماژە بۆ ئەو پرسە جیاوازانە بکەین کە لەنێوان دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانگەریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران و دادگەی نۆرمبێرگدا هەبوون لە مەڕ پرسەکانی دەستدانەوە[٦٦]:

- دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی بە گوێرەی جێگە، تەنیا ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە ئەنجامدانی تاوان لە هەرێمی یۆگۆسلافیای جاراندا تۆمەتبار کراون.

* دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ) بە گوێرەی جێگە نەبووە، بە لکە دەسەڵاتی دادوەری بەسەر ئەو تاوانبارانەی شەڕەوە هەبووە کە لە ناوچەیەکی جوگرافی دیارینەکراودا تاوانیان کردبوو.

- دادگەی نێودەوڵەتی و دادگەگەلی نیشتمانی هاودەستدانن، وەلێ دادگەی نێودەوڵەتی ICTY بەرتریی دەستدانی بەسەر دادگەگەلی نیشتمانییەوە هەیە.

* دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ) لە بری دادگەگەلی نیشتمانی بۆ دادگاییکردنی تاوانبارانی جەنگ هاتە ئاراوە .

- دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی بەگوێرەی کەس، تەنیا بەسەر کەسە سروشتییەکانەوە جێبەجێ دەبێ.

* دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ) سەبارەت بە تاك و سازمانگەلی تاوانکاری بووەو حەفت ڕێکخراوی جینایەتکاری دادگایی کردووە ( سەرکردەکانی حزبی نازی، ئەنجوومەنی وەزیرانی رایخ، S.S ، جیستابۆ S.D، سەرکردە گەورەکانی S.A ).

- دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتی هەموو پێشێلکارییەکانی قانوونی بەجێگەیەندراو لە ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی و ناوخۆ دەگرێتەوە.

* دەستدان لە دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ) تەنیا پێشێلکارییەکانی قانوونی جێبەجێکراو لە ململانەی چەکدارانەی نێودەوڵەتی دەگرتەوە.

---

[٦٦] بۆ کورتکراوەی دادگەی نێودەوڵەتیی میلیتاری پەسندکراوی ڕێککەوتنی ساڵی ١٩٤٥ی لەندەن، دادگەی نێودەوڵەتیی میلیتاری و هێمای (*) بەکار دەهێنین و بۆ دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران، کورتکراوەی دادگەی نێودەوڵەتی و هێمای (-).

- دەستدانی بابەتی: پێشێلکاریی زلی ڕێککەوتننامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف، پێشێلکاریی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ، جینۆساید، تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی دەگرێتەوە.

* دەستدانی بابەتی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ): تاوانگەلی دەرهەق بە ئاشتی، تاوانەکانی شەڕ، تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی، دەگرتەوە (هێشتا چەمکی جینۆساید بڕیاری لێ نەدرابوو، هەرچەند بە ناوەڕۆك دەکەوتە ناو تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتییەوە).

- تۆبزیگێکردن، زیندانیکردن، ئەشکەنجەدان، هەموو بە شێوەیەکی دیاریکراو، کاروکردەی تاوانبارانەن وەکو تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی چاویان لێدەکرێ ئەگەر لە کاتی ململانەی چەکدارانەدا دژی خەڵکی سڤیل ئەنجام بدرێن، هەروا بەتۆبزیگایین وەکو پێشێلکارییەکی زل بە پێی ماددە ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتی لە کێشەی تادیشدا پۆلێن کرا.

* تۆبزیگێکردن بە پێی ماددە ٦ی پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی سەربازی (نۆرمبێرگ) بە شێوەیەکی دیاریکراو بە تاوان دانەندرابوو، تەنانەت ئەشکەنجەدان و زیندانیکردنیش ئەگەر دژ بە خەڵکی سڤیل ئەنجام درابا.

هەرچی لایەنە هاوشێوەکانە لە پرسگەلی دەستداندا:

- پێڕەوی ئەساسیی هەردوو دادگە سەبارەت بە تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی وا دەخوازن کە ئەم تاوانانە لە کاتی ململانەی چەکدارانەدا ئەنجامدرابن ( لە پێڕەوی ئەساسیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە ڕواندا ئەم پێوندییە لە گەڵ ململانەی چەکدارانە ناخوازێ ).

- لە هەردوو دادگەدا، پلەو پایەی فەرمی، تاوانبار لە بەرپرسیارەتی نابەخشێ، یان سزای لەسەر سووك ناکا.

- هەردوو دادگە ڕێگە بەپەلپی فەرمانەکانی باڵا نادەن لە دادگاییکرنەکاندا، وەلێ ڕەنگە لە خەملاندنی سزاکاندا بە هەندیان وەربگرن.

## پاشبەندی ژمارە (١)

### Table 1. Violations of Laws or Customs of War

### پێشێلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ

| Crime | Yugoslav Law | Equivalent ICTY Status | PCY Minimum | PCY Maximum |
|---|---|---|---|---|
| Employment of Poisonous Weapons بەکارهێنانی چەکی ژەهراوی | | | | |
| Without lethal consequences | 148 (1) | 3 (a) | 51yr | 15 yrs |
| With lethal consequences | 48 (2) | 3 (a) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Wanton destruction etc | 148 (1) | 3 (b) | 5 yrs | 15 yts or death |
| Attack of undefended towns ect. | 142(2) | 3 (c) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| damage to institutions etc . زیانگەیاندن بە دامەزراوەکان.. تاد | | | | |
| Any in situation dedicated to | 151 (1) | 3 (d) | 1 yr | 15 yrs |
| In situation under special protection | 151 (2) | 3 (d) | 5 yrs | 15 yrs |
| Plunder of property | 142 (1) | 3 (e) | 5 yrs | 15 yrs or death |

# پاشبەندی ژمارە (٢)

## Table 2. Grave Breaches of Geneva Vonvevtions of 1949

## پێشێلکارییە زلەکانی رێککەوتنامەکانی ساڵی ١٩٤٩ی جنێف

| Crime | Yugoslav Law | Equivalent ICTY Status | PCY Minimum | FPCY Maximum |
|---|---|---|---|---|
| **Willful Killing بەئانقەست کوشتن** | | | | |
| of Civilians | 142 | 2 (a) | 5yrs | 15 yrs of death |
| Of the wounded and the sick | 143 | 2 (a) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| of prisoners of war | 144 | 2 (a) | 5 yrs | 15 yts or death |
| **Torture, etc. ئەشکەنجەدان** | | | | |
| Of civilians | 142 | 2 (b) | 5 yrs | 15 yrs of death |
| Of the wounded and the sick | 143 | 2(b) | 5 yrs | 15 yrs of death |
| Of prisoners of war | 144 | 2(b) | 5 yrs | 15 yrs of death |

Causing great suffering, etc. بەئانقەست ئێش و ئازار پێگەیاندنی توند

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Of civilians | 142 | 2 (c) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Of the wounded and the sick | 143 | 2(c) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Of prisoners of war | 144 | 2(c) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Extensive destruction, etc: | 142 | 2 (d) | 5 yrs | 15 yrs or death |

Compelling to Service, etc. بەزۆر کار پێکردن

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Of civilians | 142 | 2 (e) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Of prisoners of war | 144 | 2(e) | 5 yrs | 15 yrs or death |

Depriving of right to trial, etc. بێ بەریکردن لە مافی دادگایی

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| Of civilians | 142 | 2 (f) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Of prisoners of war | 144 | 2(f) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Unlawful deportation, etc | 142 | 2 (g) | 5 yrs | 15 yrs or death |
| Taking civilians as hostages | 142 | 2 (h) | 5 yrs | 15 yrs or death |

## پاشبەندی ژمارە (٣)

## Table 3. Statical Data Sentence Homicde, Yugoslavia, 1982-1990

## سزاگەلی تایبەت بەتاوانەکانی کوشتن

| Total Sentence | 1982 ٦٠ | 1983 ٧٥ | 1984 ٧٩ | 1985 ١٠٤ | 1986 ٨٢ | 1987 ١٠٧ | 1988 ٧٧ | 1989 ٧٦ | 1990 ٨٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Death Penalty | ٠ | ٢ | ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٢ | – | – |
| 20 Years | ٩ | ١٤ | ٢١ | ١٩ | ٢٠ | ٢١ | ٢٠ | ١١ | ١٥ |
| 15 yeas | - | - | 2 | 6 | 3 | 3 | 3 | 7 | 4 |
| Between 10-15 yrs | 19 | 25 | 22 | 29 | 27 | 32 | 19 | 24 | 30 |
| Between 5- 10 yrs | 11 | 14 | 20 | 22 | 16 | 25 | 13 | 13 | 14 |
| Between 2-3 yrs | 3 | 4 | 1 | 7 | 3 | 3 | 3 | 5 | 4 |
| Between 1-2 yrs | 7 | 2 | 2 | 7 | 1 | 3 | 3 | 2 | 2 |
| 1 yrs or less | 2 | 4 | 2 | 5 | - | 6 | 5 | 2 | 5 |
| Suspended prison sentence | - | - | - | - | - | 1 | - | 1 | - |
| Correctional measures | - | - | 1 | 1 | 2 | - | - | 2 | - |
| Finces | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| Court reprimands | - | - | 1 | - | - | - | - | - | - |
| %of sentence over 10 years | 65.0 | 70.67 | 82.28 | 13.08 | 80.49 | 75.70 | 71.43 | 71.37 | 70.79 |
| %of sentences under 5 years | 20.0 | 13.33 | 6.33 | 18.27 | 4.88 | 11.21 | 14.29 | 11.48 | 12.36 |

## پاشپەندی ژمارە (٤)

## ژمارەی پەنابەران لە بۆسنیاو هەرسک و دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا

| دەوڵەت | ژمارەی پەنابەران | ژمارەی منداڵان |
|---|---|---|
| بۆسنیاو هەرسک | ٧٥٠٠٠٠ | ٤٠٠٠٠٠ |
| کرواتیا | ٤٥٠٠٠٠ | ٢٣٠٠٠٠ |
| سلۆڤینیا | ٨٠٠٠٠ | ٢٥٠٠٠ |
| مەقدۆنیا | ١١٠٠٠ | ٤٠٠٠ |
| نەمسا | ٧٠٠٠٠ | ٤٥٠٠٠ |
| ئیتالیا | ١٢٠٠٠ | ٥٠٠٠ |
| ئەلمانیا | ١٠٠٠٠ | ٣٥٠٠ |
| هەنگاریا | ٧٠٠٠ | ٤٠٠٠ |
| هۆلەندا | ٤٥٠٠ | ٢٥٠٠ |
| چیک وسلۆفاکیا | ٥٠٠ | ١٠٠ |
| کۆی گشتی | ١٣٩٥٠٠٠ | ٧١٨١٠٠ |

## پاشبەندی ژمارە (٥)

## لایەنە وێکچوو و جیاوازەکانی نێوان دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران و دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە رواندا

**یەکەم: لایەنی وێکچوون**

**١- دامەزراندن:**

- هەردوو دادگە بە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش و بە پێی دەسەڵاتەکانی فەسڵی حەفتەمی پەیمانی UN دامەزراون و دادگەگەلی مەدەنین نەك سەربازی.
- هەردوو دادگە، دەستەی ناسەرەکین و ئەنجوومەنی ئاسایش بەپێی مادده **٢٩**ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان دایمەزراندوون، وەلێ بۆ راپەڕاندنی ئەرکە دادوەرییەکانیان، ملکەچی دەسەڵات یان بەرێوەبەرێتیی ئەنجوومەنی ئاسایش نین.
- هەردوو دادگە، دادگەگەلی تایبەتن ad hoc و ماوەی مانەوەی هەردووکیان بە گەڕانەوەی ئاشتی و ئاسایش بۆ سەر باری جارانیان لە روانداو یۆگۆسلافیای جاران بە گوێرەی بڕیارێکی ئەنجوومەنی ئاسایش، بەندە.

**٢- دەستدان:**

- هەردوو دادگە دەستدانی دیاریکراویان بە گوێرەی کات و شوێن هەیە.
- هەردوو دادگە دان بە بەرپرسیارەتیی تاوانکاریی تاکەکەس دادەنێن و تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر کەساندا دەڕوا نەك سازمان و دەوڵەتان.
- بەو پێیەی هەردوو دادگە، دادگەگەلی تایبەتن، ئەرکی ئەم دوو دادگەیە، دادگاییکردنی ئەو کەسانەیە کە لە پێشێلکارییەکانی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی کە هەنووکە کاری پێ دەکرێ، بەرپرسن.
- هەردوو دادگە هاودەستدانن لە گەڵ دادگەلی نیشتمانیدا، وەلێ لە گەڵ ئەوەشدا هەردوو دادگە بەرترییان بەسەر دەستدانی دادگەگەلی نیشتمانییەوە هەیە.
- هەردوو دادگە گەرەنتیی تایبەت بە مافەکانی تاوانپێکراوان پراکتیزە دەکەن کە گرنگترینیان: پرەنسیپە بنچینەییەکانی پاراستنی تۆمەتپێکراوانە ( مادده ١٤ی بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان).
- لە هەردوو دادگەدا، دادگاییکردنی لەپاشملە لە گۆڕێدا نییە.
- لانی ئەوپەڕی سزادان بەپێی پێڕەوی بنچینەیی هەردوو دادگەکە، زیندانیکردنی هەتا هەتاییە و بڕیاری لەسێدارەدانیان تێدا نییە.

**٣- لایەنی تری وێکچوو:**

- زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی زمانی فەرمی کارپێکراوی ناو هەردوو دادگەکەن.
- هەردوو دادگە، یەك داواکاری گشتییان هەیە (ئەویش داواکاری گشتیی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیایە).
- ژووری تێهەڵچوونەوە لە هەردوو دادگەکەدا، یەکە کە لە ٥ دادوەر پێکدێت، ئەویش دایرەی تێهەڵچوونەوەیە لە دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران.
- دادوەران لە هەر یەك لەو دادگەیە، خۆیان تابلۆی رێساکانی دادڕەوی و رێساکانی سەلماندن پەسند دەکەن کە لە دادگەدا کاریان پێ دەکەن.
- لە هەردوو دادگەدا، رێگەکارییەکانی پاراستنی قوربانییان و شایەتان دێنە جێبەجێ کردن.
- پێڕەوی بنچینەیی هەردوو دادگەکە، ئاماژە بۆ پابەندبوونی دەوڵەتان بە هاریکاریکردن لەگەڵ دادگەدا دەکەن لە هەموو قۆناخەکاندا لە  لێوەکۆڵینەوە بگرە تا دادگایی.

دووەم: لایەنی جیاوازی

١- دامەزراندن:

- دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیا لە ئایاری ١٩٩٣دا هاتە دامەزراندن، هەرچی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە رواندایە لە تشرینی دووەمی ١٩٩٤دا دامەزراوە.
- دەوڵەتی یۆگۆسلافیا، سەبارەت بە دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی بۆ یۆگۆسلافیای جاران لە دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشدا بەشدار نەبووە، بە پێچەوانەوە، رواندا خۆی داخوازی لە ئەنجوومەنی ئاسایش کرد کە دادگەیەکی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە رواندا دابمەزرێنێ و (بەو پێیەی رواندا ئەو کاتە ئەندام بووە لە ئەنجوومەنی ئاسایش) لە بڕیاری دامەزراندنی دادگەکەدا بەشدار بووە ، هەروا لە وتوێژەکانی پێڕەوی ئەساسیی دادگەکەشدا بەشداری کردووە.
- بڕیاری دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران بە کۆی دەنگی ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاسایش بووە، لە کاتێکدا لە بڕیاری دامەزراندنی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا، رواندا نارەزایی نیشاندا، چین —یش دەنگی بۆ بڕیارەکە نەدا. ئامانجی رواندا لەم نارەزاییە ئەوەبوو کە هاوبەشیی دایرەی تێهەڵچوونەوە و داواکاری گشتی لە گەڵ دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیا، سەربەخۆیی دادگەکە دەخاتە بەر مەترسییەوە. هەروا پێشنیاری کرد دادگەکە مافی ئەوەی هەبێ سزای لەسێدارەدان بڕێتەوە و دەستدانی دادگەش بە گوێرەی کات لە ١٩٩٠/١٠/١ —وە دەست پێ بکات.
- دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران بە دوو قۆناخ هاتە دامەزراندن ( واتە بەپێی دوو بڕیار) ئەوانیش بڕیاری ٨٠٨ و بڕیاری ٨٢٧ ن. لە کاتێکدا ئەنجوومەنی ئاسایش سوودی لە شارەزایی خۆی وەرگرت و بە یەك بڕیار، واتە بڕیاری ٩٥٥ دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندای دامەزراند.

٢- بارەگای دادگە

بارەگای دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران لە لاهایە (هۆلەند) و لە پێڕەوی بنچینەیی دادگەکەدا دەقبەندی کراوە، لە کاتێکدا بارەگای دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا لە (ئەروشا- پایتەختی تەنزانیا)یە و بە پێی بڕیارێکی دواتری ئەنجوومەنی ئاسایش بارەگاکەی دیاریکراوە.

٣- دەستدان

- دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران دەستدانێکی بە گوێرەی کات هەیە کە لە ١٩٩١/١/١ ەوە دەست پێدەکا، بەلاَم دوا کاتی بۆ دیاری نەکراوە. هەرچی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندایە ئەوا لە ١٩٩٤/١/١-ەوە دەست پێ دەکات تا ١٩٩٤/١٢/٣١.
- دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران بە گوێرەی شوێن، هەموو هەرێمەکانی (کۆماری یۆگۆسلافیای سۆسیالیستی فیدرالی) جاران دەگرتەوە، بەلاَم ئەوەکەی رواندا، روانداو ولاَتانێ هاوسێ دەگرتەوە سەبارەت بەو پێشێلکارییە زل و زەقانەی قانوونی نێودەوڵەتیی مرۆیی کە لە لایەن هاوولاَتانی روانداوە لەو دیوی هەرێمی روانداوە ئەنجامدراون.
- بەپێی پێڕەوی بنچینەیی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران، تاوانگەلی دەرهەق بە مرۆڤایەتی بەندیوارییی لە گەڵ کێشەی چەکدارانەدا دەخوازن، هەرچی پێڕەوی ئەساسیی دادگەکەی لەمەڕ رواندایە، ئەم بەندیوارییە ناخوازێ.
- دەستدانی دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە یۆگۆسلافیای جاران سەبارەت بە پێشێلکارییەکانی قانوونگەل و نەریتەکانی شەڕ هەم لە کێشەو ململانەی چەکدارانەی ناوەخۆو هەم نێودەوڵەتیدا دێتە جێبەجێکردن، وەلێ لە باری دادگەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە رواندا، تەنیا لە کێشەی چەکدارانەی ناوەکیدا دێتە جێبەجێکردن.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبییەکان

### أ- کتێب


- د. إبراهيم أحمد شلبي، التنظيم الدولي، دراسة في النظرية العامة والمنظمات الدولية، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٤ .
- (مبادئ القانون الدولي العام)، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٦
- د. إسماعيل الغزال، (القانون الدولي العام)، المؤسسة الجامعية للدرسات والنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٨٦
- جان بكتيه، (القانون الدولي الإنساني تطوره ومبادئه)، معهد هنري دونان، جنيف، ١٩٨٤
- (القانون الإنساني وحماية ضحايا الحرب)، معهد هنري دونان، جنيف، ١٩٨٦
- جيرهارد فان غلان، (القانون بين الأمم)، الجزء الثالث، تعريب إيلي وريل، منشورات دار الآفاق الجديدة، بيروت، ١٩٧٠
- د. حامد سلطان، (القانون الدولي العام في وقت السلم)، دار النهضة العربية، الطبعة الثالثة، القاهرة، ١٩٨٦
- خليل الحديثي، (الوسيط في التنظيمي الدولي)، محاضرات مطبوعة بالرونيو، جامعة بغداد، ١٩٨٦
- د. سهيل الفتلاوي (القانون الدولي الإنساني)، مطبعة عصام، بغداد، ١٩٩٠
- (المنازعات الدولية) دار القادسية للطباعة، ١٩٨٤
- عامر الزمالي، (المدخل الى القانون الدولي الإنساني)، المعهد العربي لحقوق الإنسان، تونس، ١٩٩٣
- د. عبدالحسين القطيفي، (القانون الدولي العام)، الجزء الأول، مطبعة العاني، بغداد، ١٩٧٠
- د. عبدالرحيم صدقي، (القانون الدولي الجنائي)، القاهرة، ١٩٨٦

- د. عبدالوهاب حومد، (الإجرام الدولي)، مطبوعات جامعة الكويت، ١٩٧٨
- د. عصام العطية، (القانون الدولي العام)، جامعة بغداد، بغداد، ١٩٩٢
- د. علي صادق أبو الهيف، (القانون الدولي العـام)، منشـأة المعـارف بالاسـكندرية، الطبعة العاشرة، ١٩٧٢
- (القانون الدبلوماسي)، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٨٧
- د. غسان الجندي، (قانون المنظمات الدولية)، مطبعة التوفيق، عمان، ١٩٨٧
- د. فريدريك دي مولينان، (دليل حول قـانون الحـرب للقـوات المسـحلة)، اللجنـة الدولية للصليب الأحمر، جنيف، ١٩٨٧
- د. فكرت كارجيش، (تاريخ التشريع الإسلامي في البوسنة والهرسـك)، أسـطنبول، تركيا، ١٤١٣هـ
- د. محمد سامي عبدالحميد، (العلاقات الدولية)، الدار الجامعيـة للطباعـة والنشـر، بيروت، ١٩٧٤
- د. محمد سامي عبدالحميد و د. مصطفى سلامة حسـين، (القـانون الـدولي العـام)، الدار الجامعية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٨
- د. محمد سعيد الدقاق، (التنظيم الدولي)، الدار الجامعية للطباعة والنشـر، الطبعـة الثانية، بيروت، ١٩٨٢
- (النظرية العامة لقرارات المنظمـات الدوليـة ودورهـا في إرسـاء قواعـد القـانون الدولي)، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٧٤
- د. محمد محيي الدين عوض، (دراسـات في القـانون الـدولي الجنـائي)، دار الفكـر العربي، ١٩٦٦
- د. محمـود نجيـب حسـني، (دروس في القـانون الجنـائي الـدولي)، دروس لطلبـة الدكتوراه، جامعة القاهرة، معهد العلوم القانونية، ١٩٥٩-١٩٦٠
- د. منذر عنبتاوي، (الإنسان قضية وحقوق)، المعهد العربي لحقوق الإنسان، تونس، ١٩٩٤

- د، هنري دونان، (تذكار سولفرينو)، (تعريف د. سامي جرجيس)، اللجنة الدولية للصليب الأحمر، جنيف، ١٩٩٤

ب- نامه

- سمير عبدالعزيز المزغني (النزاعات المسلحة في القانون الدولي)، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، كلية القانون، ١٩٧٨
- عباس هاشم الساعدي، (جرائم الأفراد في القانون الدولي)، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، كلية القانون، ١٩٧٦
- علاء الدين حسين مكي، (استخدام القوة في القانون الدولي)، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، كلية القانون، ١٩٨١

ج- لێكۆڵینەوە

- حميد منصوري (مفهوم الحرب في ميثاق الأمم المتحدة)، مبررات وقيود، المجلة الجزائرية للعلاقات الدولية، ديوان المطبوعات الجامعية بالجزائر، عدد ١٤، ١٩٨٩
- سيد هاشم، (بعض الجوانب الجنائية المتعلقة بحماية ضحايا النزاعات المسلحة)، المجلة الدولية للصليب الأحمر، جنيف، عدد ٤١، ١٩٩٥
- د. محمد أمين الميداني، (المحكمة الجنائية الدولية ليوغسلافيا السابقة)، المجلة العربية لحقوق الإنسان، تونس، عدد ٣، أيلول ١٩٩٦
- د، محمد محيي الدين عوض، (جرائم الصرب والكروات ضد شعب البوسنة والهرسك تكييفها والمحاكمة عنها دولياً)، المجلة العربية للدراسات الأمنية، الرياض، المجلد الثامن، العدد ١٦، ١٤١٤هـ ١٩٩٣م.

د- دۆكیومێنت

- ميثاق الأمم المتحدة والنظام الأساسي لمحكمة العدل الدولية الملحق به، ١٩٤٥
- اتفاقيات جنيف لعام ١٩٤٩
- الإعلان العالمي لحقوق الإنسان ١٩٤٨

- العهد الدولي الخاص بالحقوق الاقتصادية والاجتماعية والثقافية، ١٩٦٦
- العهد الدولي الخاص بالحقوق المدنية والسياسية، ١٩٦٦
- البرتوكولان الإضافيان (لاتفاقيات جنيف لعام ١٩٤٩) في ١٩٧٧
- البروتوكول الاختياري الأول للعهد الدولي الخاص بالحقوق المدنية والسياسية في ١٩٦٦
- البروتوكول الاختياري الثاني للعهد الدولي الخاص بالحقوق المدنية والسياسية في ١٩٨٩
- اتفاقية حقوق الطفل، ١٩٨٩

## سەرچاوە بیانییەکان

### أ- کتێب

- Arthur Nussboum , (( A concise History of Law of Bations)) , Newyork , 1947 .
- A. Brimo , (( Les Grands Courants de la Philosophie du droit et de L' Etat )) , 2ed , pendone , paris , 1968 .
- C. Lambios , ((Droit pe'nal International )) , 2'ed , Dalloz, Paris . 1979.
- *H.P. Gasser , (( International Humanitarian* law )) , An Introduction , Henry Dunant Institute , Haupt , 1993 .
- Dr Ivan Jankovic & Dr. Vladan Vasilijevic , (( Sentencing policies and practices in the former Yogoslavia )) , Belgrad , 1994 .
- J. Graven, "Course de droit international Pe'nal", Le caire, 1955-1956.
- J. Pictet & others, "commentary IV Geneva Convention relative to the protection of civilian persons in time of war", ICRC, Geneva, 1958.

- J. Strake, "Introduction to international law", 10th ed, Butter worth's, London, 1989.

- M. Cherif Bassiouni, "Crimes Against Humanity in international Criminal law", Martinus Nijhoff publications (8 others), 1992.

- M.C. Bassionni & Peter Manikas, "The law of the international criminal tribunal for the former Yugoslavia, transnational publisher, Inc., New York, 1996.

- M.C Bassionni & V.P. Nad, " treatise on international criminal law", Charles C. Thomas, Springfield, Illinois, 1973.

- S. Glasser, "Droit international pe'nal", Bruxelles, 1970.

- Theodor Meron, "Human Rights in internal strife: their International protection", Grotius publications, Cambridge, 1987.

- Virginia Morris & Micheal P. Scharf, "An Insider's Guide to the international criminal tribunal for the former Yugoslavia transnational Publisher, Inc. New York, Vol. 1-11, 1995.

- Woezel, "The Nuremberg trials in international law Steven sons limiter, London, 1962.

ب- لێکۆڵینەوە

- Alain Pellect, "Le tribunal criminal international pour L'ex-Yugoslavia", R.G.D.I.P., Tom 98, 1994.

- Bert V.A. Roling, "Crimes against peace", Encyclopedia of public integration law, North Hollan publishing company, Amsterdam, Vol. 1, 1992.

- C.Grynfogel, "Un concept juridigue en quete d'identite': le crime contre l' humanite'", R.I.D.P., N. 3-4, 1992.

- Christopher Greenwood, "International Humanitarian law and tadic case", EJIL, Vol. 7,1996.

- "The International trubunal for the former Yugoslavia 49 international Affairs, 1993.

- G.H. Aldrich, "Jurisdiction of the international criminal tribunal for the former Yugoslavia", Ajil, vol. 92. 1996.

- H.P Gasser, "International Non- International armed conflicts", American Uni. Review, Washington D.C., Vol,33, 1983.

- Herman Von Hebel, "An international tribunal for the former Yugoslavia, An act of power lessness or a new challenge for the international community", Netherlands quarterly of human rights, Vol. II, 1993.

- I.C.T.Y, Bulletin of I.C.T. Y, Publication of the tribunal's registry, the Hague, No.. 1-17.

- J.Co' Brien, "The international tribunal for violation of international Humanitarian law in the former Yugoslavia" AJIL, Vol. 87 1993.

- "The ILC adopts a statute for an international criminal court", AJIL, Vol. 89, 1995.

- Jean - Pierre puissachet, "Vers Un tribunal pe'nal international", Les diffculte's Droit et De'mocratie, La Documentation Francias, 1995.

- Maria Castillo, "Compe'tence du tribunal pe'nal la yuggoslavia",

R.G.D.I, Tome 98 , 1994.

- M.C. Bassiouni, "Rroject de statut du tribunal pe'nal international", "Introduction", Association international de droit pe'nal m ce're's, 1993.

- " Human Rights in the context of criminal justice : Identifying international procedural protections and equivalent protection in national constitution" , Duck Journal of comparative and international law, Vol. 3 , 1993.

- "International protection of victims" , Nouvelles Etudes Pe'nales, Association international de droit Pe'nal, ce're's, 1988.

- Monroe Leigh, "The Yugoslavia tribunal : Use of unnamed witnesses against accused", AJIL, Vol. 90, 1996.

- Morten Bergsmo, "International criminal for the former Yugoslavia: Recent development" , Human rights law journal, vol. 15 , 1994.

- Olivier corten et pierre klein, "Action humanitaire et chapitve V II: La rede' finition du mandat et des. Moyems d'action forces des Nations Unies" , A.F.D.I, 1993.

- Philip weckel, "L' institution d'un tribunal international pour re'pression des crimes de droit humanitaire en yougoslaive" , A.F.D.I., 1993.

- Stanislave E Nahlik, "A Brief outline of international humaintarian law", I.C.R.C, Julyy - August, 1984.

- Q. Wright, "Asian Experience and international law", international studies Quarterly, Vol. I. , 1959.

- Richard R. Baxter, "The municipal and international law Basis of

Jurisdiction over war crimes", B.Y.B. I. L, 28, 1951.

- Theodor Meron, "International criminalization of internal Atrocities, "AJIL. Vol. 89, 1995.

- On the Indequate reach of humanitarianand human rights law and the need for a new instrument", AJIl, Vol. 77, 1983.

- Theodor Meron & Allan Rosas, "A Declaration of Minimum Humanitarian law in the former yugoslavia", AJIl Vol . 87., 1993.

### جـ- دۆكیومێنت و بڕیارەكان

١- نەتەوە یەكگرتووەكان

- كۆمەڵەی گشتی

أ - بڕیارەكان

| No | Date | Source |
|---|---|---|
| 3 | 13/2/1946 | U.N, Official Records of general |
| 95 | 11/12/1946 | Assembly, first year, 1946. |
| 177 | 21/11/1947 | U.N. Offical Records of General Assembly (O.R.G.A), 2ed year, 1948. |
| 260 | 9/12/1948 | U.N, O.R.G.A, Third year, 1948 |
| 351 | 24/11/1949 | U.N, O.R.G.A, four year, 1949. |
| 1187 | 11/12/1957 | U.N, O.R.G.A, eleven year. 1957 |
| 2392 | 26/11/1968 | U.N.O.R.G.A, twenty - three year, 1968 |
| 3074 | 13/12/1973 | U.N.O.R.G.A, twenty - eight, 1973. |
| 3314 | 14/12/1974 | U.N.O.R.G.A, twenty - nine, 1974. |
| 88 | 20/12/1993 | U.N.O.R.G.A, forty - seven year. |
| 143 | 20/12/1993 | 193 |
| 10 | 8/11/1994 | U.N.O.R.G.A, forty - nine year, |
| 205 | 23/12/1994 | 1994 |

| | | |
|---|---|---|
| IT- 94 - 1-AR72 | 2 Oct. 1995 | Separate opinion of Judge ABi-saab on the defense motion for interlocntor appeal on Jurisdiction |
| IT- 94 - 2-R.61 | 9 Ocy. 1995 | Rul 61 hearing |
| IT- 94 - 2-R.61 | 9 Oct. 1995 | Rul 61 hearing (opening) statement by Justice Goldstone. |
| IT- 95 - 13-R61 • | 24 April 1996 | Letter of president cassese to the security council , Rule 61 proceedings "Vukovar Hospital". |
| NON | 25 April 1996 | Statement of Mr.A Casses president of U.C.T.Y., to the parliamentary Assmbly of the council of Europe. |
| CC/ PIO/ 075-E | 23 May 1996 | President Casses reports to security council on the continuing violation. By the FRY of its obligation to cooperate with I.C.T.Y. |
| CC/ PIO/ 076 | 24 May 1996 | Meeting in Bonn between ICTY president and German Ministers. |
| CC/ PIO/080 -E | 26 May 1996 | Commencent address by his justice Richard J. Goldston at the European Division of the University of Maryland, university college at Mannheim, Germany. |
| 1/94 | 25 June 1996 | Directive on assign ment of defense counsel (as amended). |
| IT- 96 -22- T | 11 Nov. 1996 | Preosecuto's brief on aggravating and mitigating factors. |
| IT- 96- 22-T | 13 Nov .1996 | Orders of measures of protection witness (x) and for witness(y), trial chamber 11. |
| IT- 96- 22-T | 29 Nov. 1996 | Sentencing judgement. |
| IT- 95- 14-T | 4Dec. 1996 | Defense motion to strike portions of amended indictment alleging "failure to punish: liability. |
| IT- 95- 14 - T | 16 Dec. 19960 | Defense motion to dissmiss count 4, 7, 10, 14, & 18 Based on failure to adequately plead existence of international armed conflict. |

- ئەمینداریەتی گشتی

| | | |
|---|---|---|
| E/ CN. 4/1992/ S- | 10/8/1992 | Letter fro, president of Bosnia and Herzeg - orina addressed to SG. of UN |

- گرنگترین بڕیارەکانی دادگەی نێودەوڵەتیی تاوانکاریی تایبەت بە یۆگۆسلافیا

| Doc. No | Date | Title |
|---|---|---|
| IT- 94-1-D | 8 Nov. 1994 | Decision of the trial chamber on the application by the proscutor for a formal request for defferal to t he competence of he international al tribunal in the matter of Dusko Tadic. |
| IT-94-1-T | 23 June 1995 | Brief of support the motion (of the defence) of the tribunal before the trial chamber of international tribunal. |
| IT- 94 - 1-T | 23 June 1995 | Defense motion on Jurisdiction of the tribunal. |
| IT- 94 - 1-T | 10 Aug. 1995 | Decision on the defense motion on Jurisdiction in the tvial chamber of the international tribunal. |
| IT- 94 - 1-AR72 | 25 Aug. 1995 | Defense brief to support the notice of interlocutory appeal. |
| IT- 94 - 1-AR72 | 20 Oc. 1995 | Separate opinion of judge Sidhaw on the defense motion for interlociouroy appeal on jurisdiction. |
| IT- 94 - 1-T | 1 Sep . 1995 | Presecutor's response to the defense Brief |
| IT- 94 - A72 | 2 Oct. 1995 | Decision on the defense motion for interlocutory appeal on Jurisdiction. |
| IT- 94 - 1-AR 72 | 2 Oct. 1995 | Sparate opinion of Judge Lion the defense motion for interlocutory appeal on Jurisdiction. |

ب- دۆكیومێنت

گۆڤاری ناوبەناوی لیژنەی قانوونی نێودەوڵەتی

I.L.C, I.L.C Report 1993.

I.L.C, I.L.C. , Report 1995.

H.R.C., 39th sess supp No.40., Doc (A/39/40), 1980.

H.R.C., 39 the sess, supp. No. 40, Doc (A/43/40). 1984.

- ئەنجومەنی ئاسایش

أ - بڕیارەكان

| No | Date | Source |
|---|---|---|
| 465 | 1/3/1980 | U.N., offical records of |
| 469 | 20/5/1980 | security council (O.R.S.C), |
| 471 | 5/6/1980 | thirty -five year,1980 |
| 478 | 20/8/1980 | |
| 497 | 17/12/1981 | U.N.O.R.S.C., thirty - six year, 1981. |
| 607 | 5/1/1980 | U.N.O.R.S.C forty - three year , 1988. |
| 724 | 15/12/1991 | U.N.O.R.S.C , forty-six year, 1991. |
| 727 | 8/1/1992 | |
| 723 | 21/2/1992 | U.N.O.R.S.C, forty - seven |
| 740 | 27/2/1992 | year , 1992 |
| 758 | 8/7/1992 | |
| 764 | 13/7/1992 | |
| 769 | 7/8/1992 | |
| 771 | 13/38/1992 | |
| 808 | 22/2/1993 | U.N.O.R.S.C, forty - eight |
| 827 | 25/5/1993 | year 1993 |
| 857 | 20/8/1993 | |
| 925 | 8/5/1994 | U.N.O.R.S.C, forty nine |
| 935 | 1/7/1994 | year , 1994 |
| 955 | 8/11/1994 | |
| 977 | 22/2/1995 | U.N.O.R.S.C, fifty year, 1995. |

٢- دۆكیومێنتی تر

1- Eur, Ct. H.R., Piersack V. Belguim, App. No. 8692/ 79, 47, (Ser, B), 1981.

2- Eur. Comm. H.R., Zand V. Austria App. No 7360/76, Dec & Rep 70 1979.

3- Inter - Am . C.H.R., Annual report 1972, OEA/ ser. P. , AG/ doc. 305/73, rev. 1, 14 March 1973.

4- Inter- Am. C.H.R., annual report 1973, OEA/ Ser. P., AG/ doc. 409/704, 5 March 1974.

5- I.C.R.C, I.C.R.C., Annual reports 1988.

6- Agreement for the presecntion and punishment of Major war criminals of the European axis, containing the charter of the international military tribunal, 1945.

7- Charter of international military tribunal for the trial of major war criminals in the far EST, 1946.

8- Law Nr.10 for allied control council, 1945.

9- Convention on the prevention and punishment of the crime of genocide, 1948.

10- Convention for the protection of human rights and fundamental Freedoms1950.

11- American convention on human rights, 1969.

12- International convention on the suppression and punishment of the crime of apartheid, 1973.

13- Convention against touture and other curel, Inhuman or degarding treatment or punishment, 1984.